# شاشەی گەورە و منداڵی چکۆلە

## لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی هاوکاریکردنی خێزان و منداڵ بۆ بەکارهێنانی تەلەڤیزیۆن

غازی حەسەن




٢٠١٣



**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **شاشەی گەورە و منداڵی چکۆلە.**
- **لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی هاوکاریکردنی خێزان و منداڵ بۆ بەکارهێنانی تەلەڤیزیۆن**

---

- **نووسین: غازی حەسەن**

---

- **نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ:** ڕێدار جەعفەر

---

- **نرخ:** ١٥٠٠ دینار

---

- **چاپی یەکەم:** ٢٠١٣

---

- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە

---

- **چاپخانەی: موکریانی (هەولێر)**

---

- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧٤١) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

---

**زنجیرەی کتێب (٧٦٠)**

M U K I R Y A N I

ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

## پێشکەشە . . .

بەو منداڵانەی تێری سەیرکردنی تەلەڤیزیۆن نابن..

بە رەحمەتی مەلا عوسمان گەرەشێخانی باوکی هەردوو شەهید عەبدوڵڵا و تەلعەت، کە بۆیەکەمجار لە چاپخانەکەی ئەو لەگەڕەکی مەنتکاوە، لە دوای رێککەوتنی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ تەلەڤیزیۆنم بینی.

## بەرایی:

کاتێک بمانەوێت باسی روداوهەرە گرینگەکانی ژیانی مرۆڤایەتی بکەین، دەبێت لەسەر مێژووی سەرهەلدانی تەلەڤیزیۆن وەکو داهێنراوێکی نوێ بوەستین.. تەلەڤیزیۆن هێندە لەمێژ نییە دۆزراوەتەوە، ئەوانەی بەکاریشیان هێناوە، رێژەکەیان زۆر کەم بووەو لە ولاتێکیشەوە بۆ ولاتێکی تر گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

تەنیا لە ناوەراستی سەدەی بیستەمدا تەلەڤیزیۆن هاتە نێو کۆمەلگاو خەڵک چەندە بە خۆشی سەیریان دەکرد، لەهەمان کاتیشدا بە شتێکی عەنتیکەو سەرسوڕهێنەرو فیلم و پرۆگرامەکانیشی بە ناراست و خەیاڵی خەڵک خەلەتێن ناو دەبرد..بەتایبەتیش کەسانی دیندارو خوا پەرست زۆر بە نارەحەتی و نیگەرانییەوە لەم داهێنانە نوێیەیان دەڕوانی. لەبیرمە کە خەڵکی نەخوێندەواری دەروپشتی من لە سەرەتای حەفتاکان و نانزیکی هەشتاکانیش کردەو فیلمەکانی نێو تەلەڤیزیۆنیان بە درۆ دەزانی، ترس و گومانیشیان هەبوو لە گۆڕانکاری کۆمەلایەتی کە تەلەڤیزیۆن دروستی دەکرد. بۆیە هەندێک تا تەلەڤیزیۆن خۆی کوتایە ناو ماڵەکانیان بە کوفرو بێ دینیان

لەقەڵەم دەدا. وەلێ کاتێک دەگەڵ دەنگ و وێنە رەش وسپیەکانی نێو تەلەڤیزیۆن راهاتن، ئیتر بیرۆکەی دژایەتی ئەم شاشە پڕ بزاڤ و جولەیان گۆڕی.

هیچ گۆرانکارییەکی نوێ بێ بەرهەلستکاری و هیچ داهێنانێکی تازەش بێ دژایەتی نابێت، بۆیە ئاساییە رێژەی پێشوازی کردن لەتەلەڤیزیۆن لەبەر کۆمەلێک هۆکار وەکو ئەوەی ئێستا نەبێت کە منداڵی بچوکیش دوور لێی ناتوانێت ئارام بگرێت.

لەساڵی ١٩٥٠دا تەنیا ١٠هەزار کەسی سەیرکەری تەلەڤیزیۆن هەبوو، بەڵام لەساڵی ١٩٩١دا بەرێژەی %٨٠ دانیشتوان سەیری تەلەڤیزۆن لەهەموو رۆژێکدا دەکەن و لە چین ساڵی ١٩٧٥ رێژەیەکی کەم تەلەڤیزیۆن دەبینرا، بەڵام ساڵی ١٩٨٨ زۆر پێشکەوتووبوو، نزیکەی ٨٠٠ ملیۆن سەیر کەر هەبوو.لە ساڵی ١٩٩٠دا ماڵەکانی (ریۆ دە ژانیەرۆ) تەلەڤیزیۆن پتر لەئاو لەنێو ماڵەکانیاندا بەکاردەهێنن. ئەم حالەتی پەرەسەندنی تەلەڤیزیۆنە لە ئوردن و ئیسرائیلشدا گەشەی کردووە. لە پاکستان وەرزێرەکان پتر لە تەلەنتەر بایەخ بە تەلەڤیزیۆن دەدەن و سەتەلایت بەکارهێنان لە هیندستان لەماوەی شەش ساڵدا لە ١٠٠ ەوە بۆ ٤هەزار بەرز بۆتەوە. تەنیا ئەم سەتەلایتانە کە پشتیان بەتەنیا دوو کەنال دەبەستا دواتر بەرز بوونەوە بۆ شەش کەنال.(١)

یەکەمین خزمەتی تەلەڤیزۆنی رێکخراو لە ١٩٢٨ لە ویتونم میرلاند لەلایەن جەنگیز لەناوچەکانی دەورپشتی واشەنتەنی پایتەختدا دامەزرا، تاکو ماوەی هەژدە مانگ درێژەی کێشا. هەروەها هوگۆش لە نیۆرک دەستی بەپەخشی ئیزاعەیەکی ئاسایی کردو لە ئۆگێستی

١٩٢٨ بۆ کاتێکی دایریکراو پەخشی تەلەڤیزیۆنی کرد. جەنەرال ئەلەکتریکیش لەنیۆرک لەیەنایری ساڵی ١٩٢٨دا بەراستەوخۆیی بەلام بە وێنەی پچر پچڕ پەخش کرد. سەبرەت بە لۆس ئەنجلسیش لە سپتێمبەردا چوار تەلەڤیزیۆنی هەفتانەیان دروست کرد.

لە ٢٨ نیسانی ١٩٣١ لە نیۆرک بۆیەکەمجار ئیزاعەی وێنەدار پەخشکرا، کەتایبەت بوو بە خۆپیشاندانی هۆلی ئەیولایان لەشەقامی ٥٥و ٤.هەروەها سی بی ئێس بۆیەکەمجار لەنیۆرک لە ٢١ی یۆلیۆی ١٩٣١دا بۆ ماوەی حەفت رۆژ لەهەفتەیەکدا پەخشی دەست پێکرد.

لەکەنەدا لە٦ی کانونی یەکەمی لەمونتریال وکیبیک ١٩٥٢ بۆیەکەمجار پەخشی تەلەڤیزیۆنی دەستی پێکردو بەزمانی ئینگلیزی وفەرەنسی دەئاخڤت ودواتر لەئەیلولی هەمان ساڵدا لە تورنتو و ئەونتاریو راستەوخۆ پەخش دەستی پێکرد.

لەفەرەنساس بۆیەکەمجار لە تشرینی دووەمی ١٩٢٩دا بەرنار یەکەمین کۆمپانیای تەلەڤیزیۆنی دروست کرد.دوای ئەوە دەستکرا بە پێشخستنی ئەم بوارەو لە ٦ی کانونی یەکەمی ١٩٣١ هینری دی کۆمپانیای دی دامەزراندو لەکانونی دووەمی ١٩٣٢دا باسەلەمی یەکەم ئەزمونی تەلەڤیزیۆنی رەش و سپی دەستپێکرد، بۆماوەی یەک کاتژمێر لە هەفتەیەکدا. تاکو لەسەرەتای ساڵی ١٩٣٣ بوە رۆژانە.

یەکەم کەنالی رەسمی تەلەڤیزیۆنی فەرەنسی لە ١٣ی شوباتی ١٩٣٥ دەستی پێکردو کە تەنیا ١٥ دەقە بوو، لە ٨:١٥ تاکو ٨:٣٠ دەقەی ئێوارە.

ساڵی ١٩٢٩ش پرۆگرامی کارەبایی لەئەلمانیا دەستی پێکرد، بەڵام نەتوانرا سودی لێوەرگیرێت تاکو ساڵی ١٩٣٤. لە ٢٢ی ئازاری ١٩٣٥

تۆڕی ئەلەکترۆنی دەستی بەخزمەت کردو دەست بەگوازتنەوەی فیلم لەرێگەی هێلی تێلیکۆین دەستی پێکرد.

بەریتانیاش بۆیەکەمجار لەرێگەی بەکارهێنانی کارەباو لەسەر سیستەمی دەستەی ئیزاعەی بەریتانی لە ئەیلولی ١٩٢٩ یەکەم تەلەڤیزیۆن دەستی بەکار کرد. پێش ساڵی ١٩٣٠ تەنیا ٥ رۆژ لەهەفتەیەک وبە بەرهەمی دیاریکراو دەستی بەکار کرد.لە ٢٢ی ئابی ١٩٣٦دا بی بی سی دەستی بەکار کرد، کەئێستا بەیەکێک لە دهزگا جیهانیەکانی تەلەڤیزیۆن و راگەیاندن دادەنرێت.

دەبێت ئاماژە بەوەش بکەم کە یەکەمین پەخشی راستەوخۆ لەکیشوەری ئەوروپا لە ٢٧ی ئابی ١٩٥٠ بوو.

یەکێتی سۆڤیەتیش لە ٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٣١ پەخشی تەلەڤیزیۆنی دەست پێکرد. یەکەمین ئەزمونی تەلەڤیزیۆنی ئەلەکترۆنی لە مۆسکۆ لە ٩ی ئازاری ١٩٣٧ ئەنجام درا.

دوای ئەوەش بواری تەکنەلۆژی گەشەکردنی زۆری بەخۆیەوە بینی و پەخشی ئاسمانی و راستەوخۆو تەلەڤیزیۆنی رەنگاورەنگ و ئێستاش بەکارهێنانی هێلی تەلەفۆن و سەتەلایت و مانگە دەستکردەکان وێنەو دەنگ لە چرکە ساتێک و لەهەمان کاتی روداوەکاندا پەخس دەکرێت. تەنیا مرۆڤ دەتوانێت کۆبوونەوەو دیداری خەلکانێک بکات، لەدوریی سەدان هەزار کیلۆمەتر بە وێنەو دەنگ.

بۆیەکەمینجار لەساڵی ١٩٣٧ لەلایەن زاناو کەسانی شارەزا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تەلەڤیزیۆن دروست کرا، بەڵام هەمان ئەو پێکهاتە ئەلەکترۆنیەی ئێستایان نەبوو، بەڵام دەکرێت سەرەتای ئەم هەنگاوە سادەیە بە پێشکەوتنێکی گرینگ لە مێژووی تەکنەلۆژی

بژمێردرێت. شاشەی تەلەڤیزیۆن زۆر بچوک وبوو بە فانسۆێکی بچوک کاری دەکردو  ماوەی ساڵی ١٩٣٥ لە مێژووی گەشەکردنی تەکنەلۆژی بە سەردەمی تەلەڤیزیۆنی میکانیکی دەناسرێت. دیارە ئەم دۆزینەوەیە بۆ ئەو سەرەتایە دەگەرێتەوە کەهەردوو دکتۆر فرانک رمادی ودکتۆر هیربرت لیڤیس لەبواری ناردنی برسکەی ئەلەکترۆنی دۆزیانەوە ئەویش ناردنی ئەو بروسکانە بوو بە وێنەو دەنگ لە واشنتەنی پایتەختەوە بۆ شاری نیۆرک، هەروها لاسلکی دۆزراوە کە لەناوچەی ویبانی ویلایەتی نیوجەرسی بەکار هات تاکو نیۆرک بەبڕینی ٢٢ میل. لە کۆتایی ساڵانی بیست و سەرەتای ساڵی ١٩٣٠ بۆیەکەمجار کار کرا وێنەی تەلەڤیزیۆنی بگوازرێتەوەو نیسان بدرێت. دونا لام کەخاوەنی ماستەرە لە بەشی رۆژنامەگەری دەڵێت خەلکێک وادەزانن تەلەڤیزییۆن بۆیەکەمجار ساڵی ١٩٤٨ هاتۆتە بۆستن لەئەمەریکا، نەخێر لەراستیدا ساڵی ٤ئایاری ١٩٢٨دا بۆیەکەمجار وتشارلز ها هادلی بلاوی کردۆتەوە کە بەم نزیکانە کەنالێکی ئیزاعە بە دەنگ و وێنە دروست دەکرێت.

بۆ پتر زانیاری دەربارەی هەولەکانی دروستکردنی تەلەڤیزیۆن لەئەمەریکا ئاماژە بەوە کراوە کەلە ساڵی ١٩٣٩ تاکو ئەمرۆ پتر لە ٢٢٠ ئامرازی تەلەڤیزیۆنی لەلایەن کۆمپانیای جودا دروست کراون

| لایەنە بەرهەمهێنەکان | ساڵەکانی دروستکردنی تەلەڤیزیۆن(٢) |
| --- | --- |
| ئەمیرال | ١٩٤٧ – ١٩٧٩ |
| میژی (ئێستا چینیەکان کڕیویانە) | ١٩٧٥ - تاکو ئێستا |
| ئەندریە | ١٩٤٧ - ١٩٧٨ |
| قاعیدە | ١٩٤٧ - ١٩٦٥ |
| کابلیست | ١٩٤٧ - ١٩٦٨ |
| کاپەهارت | ١٩٤٧ - ١٩٦٥ |
| تاقیگەکانی ئیزاعە | ١٩٤٧ – ١٩٦٦ |
| کلیرەتۆن | ١٩٦٧ |
| ئیزاعەی کۆلۆنیالەکان (سیلڤانیا) | ١٩٤٩ - ١٩٨٣ |
| ڕەنگی ئەلەکترۆنیەکان | ١٩٦٤ |
| کۆنار | ١٩٦٢ |
| ئیدارەی کۆچ و نیشتەجێبوون | ١٩٤٨ – ١٩٧٠ |
| کورتیس- ماسیس | ١٩٦٠ – هەتا ئێستا |
| دیلمۆنیکۆ | ١٩٦٧ |
| دومونت | ١٩٣٨ – سەرەتای حەفتاان |
| ئیمرسون | ١٩٤٧ - ١٩٧٣ |
| فارنسورس | ١٩٤٧ – ١٩٦٥ |
| فوجیتسو | ١٩٩٢ – تاکو ئێستا |
| جەنەرال ئەلکتریک | ١٩٤٧ – ١٩٨٦ |
| گۆلدستار | ١٩٨٣ |

| | |
|---|---|
| هارفی | ١٩٨٩ |
| هیتاشی | ١٩٧٥ – تاکو ئێستا |
| هۆفمان | ١٩٤٨- ١٩٧٠ |
| ئیزاعەی هوارد | ١٩٤٨ – ١٩٧٣ |
| جینسین | ٢٠٠٣ – تاکو ئێستا |
| جەی ڤی سی | ١٩٧٦ – تاکو ئێستا |
| کینئەلەکترۆنی | ١٩٦٧ |
| کلۆس ڤیدیۆ | ١٩٨١ |
| ماگنۆڤۆکس | ١٩٤٨ – ١٩٧٦ |
| فیلیپس | ١٩٧٦ – هەتا ئێستا |
| مارانتز | ١٩٩٢ – تاکو ئێستا |
| ماتسوشیستا (بانسونیک، وطنیە،کوازار، التعلیم التطبیقی، رامسا). | ١٩٥٩- هەتا ئێستا |
| ماتتیسۆن | ١٩٤٩ – ١٩٦٨ |
| الزئبق و المحیط الهادی | ١٩٥٠ – ١٩٦٤ |
| میتسوبیشی | ١٩٨٠ – هەتا ئێستا |
| موتورولا | ١٩٤٧ – ١٩٧٤ |
| مونتز (ئیزاعەی هوارد) | ١٩٤٨ – ١٩٧٣ |
| اللجنە الوطنیە للانتخابات | ١٩٨٩ |
| نیڤیکۆ(ڤیکتۆر کۆمپانای نیبۆن) شەستەکان | |
| بینینی ئەمەریکای باکور | ١٩٦٢ |
| ئەولەمپی | ١٩٤٨ – ١٩٧١ |
| الجوزاء | ١٩٨١ |

| | |
|---|---|
| باكارد بيل | ١٩٤٨ – ١٩٧٤ |
| باناسونيك (ماتسوشيتا) | ١٩٧٥ – هەتا ئێستا |
| كۆمپاناى فۆلدليفيا بۆ پاترى | ١٩٤٧ – ١٩٧٦ |
| فيليبس | ١٩٧٦ – هەتا ئێستا |
| فيلمۆر | ١٩٤٨ – ١٩٦٥ |
| الرائيد (ژەررۆلد) | ١٩٦٤ |
| الرائيد | ١٩٨٥ |
| راڤينس ود | ١٩٦٢ |
| ئار سى ئەى ماركەى بازرگانى | ١٩٤٦ – ١٩٨٦ |
| هەلسەنگاندى بەرهەم و تواناكن (تومسون، تەكنەلۆژيا تەمسون) | |
| هەلسەنگاندنى بەرهەم و تواناكان لەبازارى سكەنيوم | |
| | ١٩٨٧- تاكو ئێستا |
| سامپۆ | ١٩٨١– هەتاكوئێستا |
| سامسۆنگ | ١٩٨٩ – تاكو ئێستا |
| سانابريا | ١٩٦٠ |
| سانيو | ١٩٧٧– هەتاكوئێستا |
| سانسوى | ١٩٨٧ – تاكو ئێستا |
| كارلسون | ١٩٥٠ – ١٩٧٠ |
| حاد | ١٩٨٣ – تاكو ئێستا |
| سونورا | ١٩٦٢ |
| سونى | ١٩٦١- هەتاكوئێستا |
| سيلڤانيا | ١٩٤٩ – ١٩٨٣ |
| سيمفونى | ١٩٦٠ |

| | |
|---|---|
| تاتونگ | ١٩٧٩ – تاكو ئێستا |
| ماستەر لە تەقەنیە | ١٩٤٨ - ١٩٦٨ |
| تێلەكویپ | ١٩٤٩ – ١٩٦٨ |
| سەندیكای دكتۆرانی توركیا | ١٩٤٨ -١٩٧٣ |
| تومسون | ١٩٨٧ – تاكو ئێستا |
| توشیبا | ١٩٧٦ – تاكو ئێستا |
| ترانسڤیسۆن | ١٩٤٧ -١٩٦٧ |
| تاڤ -١ | ١٩٤٨ – ١٩٦٥ |
| واروِیك | ١٩٥١ – ١٩٧٧ |
| ئابار گاردنر | ١٩٤٨ – ١٩٩٠ |
| ویستینگوس | ١٩٤٧ – ١٩٦٩ |
| ئەوژ | ١٩٤٨ – تاكو ئێستا |

با سەیرێکی ڕێژەو ژمارەی بینەرانی هەندێک لە کەنالەکانی تەلەڤیزیۆنی ئەمەریکی لەنێوان ٢٢-٦ تاکو ٢٠-٧ی ٢٠٠٨ بکەین، کەلەرۆژنامەی یوئێس ئەی تودەی بڵاوکراوەتە،هاتووە کەنالی FOX ژمارەی بینەرانی ٧.١ ملیۆن و هەروەها CBS سی بی ئێس ٦.٤ ملیۆن بینەرو ٥.٥ ملیۆن لەکەنالیABC ئەی بی سی و ٤.٥ ملیۆن بینەر لە کهنالی NBC ئێن بی سی و ٣.٤ ملیۆن بینەر لەکەنالی UNI یو ئێن ئای و ١.٧ ملیۆن بینەر لەکەنالی CW سی دەبلیو.

لەوەرزێکیشدا ئاماژەکانی سەیرکەرانی ئەم کەنالانە بەپێی تەمەنەکان گۆرانیان بەسەردا هاتووە، ئەمە تایبەتە بە وەرزێک لەساڵدا، تەنیا ئەمجۆرە ئامارە دەریان دەخات کە کامە پرۆگرام و نواندن و فیلم و پرۆگرامی تایبەتی تەلەڤیزیۆنەکان ززۆرترین بینەریان هەبووە. گرینگ لەوەرزێکدا بەمجۆرە بووە کەنالی فۆکس هەموو تەمەنەکان ١٠.٣ ملیۆن بینەرو لەتەمەنی ١٨-٤٩ ش بەرێژەی ٥.١ ملیۆن بینەری هەبووە، هەروەسا کەنالی سی بە ئێس ٩.٨ ملیۆن بینەر لەسەرجەم تەمەنە جوداکان و ٣.٦ ملیۆنیش لەتەمەنی ١٨-٤٩ ساڵی سەیریان کردووە. ٨.٦ ملیۆن کەس لەتێکڕای تەمەنەکان سەیری کەنالی ئەی بی سی کردووەو ٣.٧ میلۆن بینەریش لەتەمەنی ١٨-٤٩ ساڵی سەیری ئەم کەنالەیان کردووەو لەهەمان وەرزیشدا ٧.٧ ملیۆن کەس لەتەمەنی جودا سەیری کەنالی ئێن بی سیان کردووەو ٣.٤یش لەبینەرانی تەمەن ١٨-٤٩ سەیریان کردووەو هەروەها ٣.٥ ملیۆن کەسی تەمەن جوداو ٢.٠ ملیۆن کەس لەتەمەنی ١٨-٤٩ ساڵی سەیری کەناڵی یو ئێن ئایان کردووەو ٢.٤ ملیۆن لەکەسی تەمەن جوداو ١.٣ ملیۆن کەسیش لەتەمەنی ١٨-٤٩ ساڵی سەیری کەنالی سی دەبلیویان کردووە.

نامەوێت لێرەدا بچمە نێو تێکڕای ئەم ژمارەو ئامارانەی لەمبارەوە بڵاوکراوەتەوە، تەنیا ئاماژە بە سەیرکەرانی هەواڵەکان و قسەکردن لەچەند کەناڵێک دەکەم وەکو لەخوارەوە هاتووە:

هەواڵی ئێواران و قسەکردن (٣)

| کەناڵەکان و ناوی بەرنامەو پێشکەشکەرانی | تکێڕای بینەرانی بەملیۆن |
|---|---|
| ئێن بی سی هەواڵی شەوان (براین ویلەمس) | ٧.٢ |
| ئەی بی سی هەواڵی جیهانی (چەریس گیبسۆن) | ٧.٢ |
| سی بی ئێس هەواڵی ئێوارە (کاتی کۆریک) | ٥.٥ |
| کێبل - فۆکس هەواڵ (رۆیەلتی فاکتۆر) | ٢.٤ |
| فۆکس هەواڵ (هانتتی و کۆلمس) | ١.٨ |
| فۆکس هەواڵ (ریکۆرد) | ١.٤ |
| فۆکس هەواڵ (راپۆرتی فۆکس) | ١.٣ |
| سی ئێن ئێن (لەرری کینگ لیڤ) | ١.١ |

ئەگەر سەرنجێکی خێرایی تەلەڤیزیۆن لەکوردستان بدەین، پیویستمان بە بەکارهێنانی بیرکردنەوەو بیر تیژی زۆر نییە، چونکە ئەم ئامێرە بەکارهێنانی زۆر تازەیەو پتر لەسەرەتای حەفتاکان وەکو ئامێرێکی بەکاربراو کەوتە دەستی خەلکی و کەنالی کوردیش لەتەلەڤیزیۆندا هەر تەنیا ئەو کەنالە بوو کە لەتەلەڤیزیۆنی تەئمیم پەخش دەکرا. ئەم پەخش کردنەش پەیوەندی بە سیاسەتی دەسەلاتی ناوەندی و پروپاگەندە کردن بوو، بۆ رژێمی فاشی. بەلام دەکرێت وەکو بەشێک لە مێژووی سەرهەلدانی تەلەڤیزیۆنی کوردی سەیر بکرێت.

دوای راپەرینی ئازاری ١٩٩١ رەوشی بەکارهێنان ودروستکردنی کەنالی تەلەڤیزیۆنی کورت پەخش و ناوەخۆیی لەئاستی شارەکان لەلایەن حیزبە سیاسییەکاندا سەری هەلدا. ئەمەش بە پشت بەستن بە ئەنازیاری ناوەخۆیی و کادرو رۆژنامەنووسی کوردی و کەرەستەی بەرهەمهێنانی زۆر سادەو ساکاری وەکو کامیرای بچوکی وێنەگرتن و بەکارهێنانی ڤیدیۆی سادەو ساکار بۆ مۆنتاژ. کارەکە زۆر جدی بوو، هەرچەندە دەستپێکردنێکی ساکارو سەرەتایی بوو. بەلام ئێستا دوای ١٥ سال لەم ئەزمونە گرینگە خۆمالیەی کورد بە تواناو لیهاتوویی خۆی دەستی پێکرد، بارودۆخەکە زۆر گۆرانی بەسەر داهاتووە. لەتەک کەنالە ناوەخۆییەکاندا کەنالی ئاسمانی کوردیش پەیدا بوون، کە راستەوخۆ لەسەرتاسەری دونیادا پەخش دەکرێت و بەرنامەکانیش هەمە رەنگن و ئاراستەی جودایان بە خۆوە گرتووە. کەنالی (میدیا) و (کوردستان) و (کوردسات) و (میزۆپۆتامیا) و (رۆژ) و (زاگرۆس) و (ئاشوری) ئەوانی تریش رۆلێکی گرینگ و دیار لە بواری راگەیاندن دەبینن.

واتە بۆمان دەردەکەویت کە تەلەڤیزیۆن لەتەک بوارەکانی تردا هێشتا دەتوانێت رۆلیکی دیار بۆ گەیاندنی هەوال و بلاوکردنەوەی رۆشنبیری و بایەخدان بە بوارەکانی گەیاندن وبلاوکردنەوەی زانیاری هەمەجۆر بدات.

لەتەک بەرنامە سیاسی رۆشنبیرییە کاندا، بایەخێکی زۆریش بە تەرخانکردنی ماوەیەک بۆ بەرنامەی مندالآن دەدرێت، راستە ئا ئێستاش پرۆگرامەکانی مندالآن شتی خواستراو و بەزمنای بیانی، یا دۆبلاژە. زۆر کەم بایەخ بە دروستکردن وبەرهەمهێنانی بەرهەمی خۆمالی مندالآن دەدرێت، ئەمەش وەکو بەشێک لە کەموکوڕییە سەرتاسەرییەکانی تر دەردەکەون. هەندێکجار بیر لە پرۆگرامی پەروەردەیی مندالآن کراوەتەوە، بەلآم ئەمیش شێوەیەکی تری هۆلی قوتابخانەکانی بەخۆوە بینوە، لە باسکردنی وانە زانستی و کۆمەلایەتییەکان، کەلەراستیدا دەتوانرێت بەم بەرنامانە بگوترێت هۆلی قوتابخانە بۆ یارمەتیدانی قوتابی، بەلام ناچێتە خانەی پرۆگرامی پەروەردەیی مندالآن، چونکە ئەمە بەشێکە لە فشاری دەروونی بۆ سەر مندالّ نەک سوکردنی کێشەکانی. بۆ پەروەردەکردنی مندالّ رێگەی ئاسان و پڕتینو تاو هەن، نەک گواستنەوەی پۆل بۆسەر شاشەی تەلەڤیزیۆن، کە ئێمە دەزانیین بەشی زۆری قوتابیان لە کات و شێوازی دانیشتن و دەرسگوتنەوەی کلاسیکی مامۆستایان بێزار بوون

بۆ پەخشکردنی بەرنامەی پەروەردەیی پێویستمان بە بەرنامەی مۆدێرن و بەرهەمی تازەی (خوێندنەوەو ماتماتیک و وەرزش و گۆرانی و کۆمەلایەتی) هەیە، ئەمانەش دەکرێت لەرێگەی فیلمە کارتۆنی و دۆکۆمینتییەکان و بەکارهێنانی گۆرانی و یاری و گەمە فۆلکۆری و شێوازە مۆدێرنەکان بێت.

لێرە هەولدەدەین هەندێک لەو سەرەتایانە نزیک بکەوینەوە کە هاوکاریمان دەکەن بۆ تێگەیشتن و راهاتن لەگەل سۆسیۆلۆژیا میدیای مندالآن، کە تیکرا جودایە دەگەڵ بیرکردنەوەهو خواستی گەورەکان لە چۆنیەتی مامەلەکردن و گواستنەوەو بەکارهێنانی سەرچاوەکانی زانیاری و مەعریفە. کاتێک باسی جودایی دەکەین، پێویستیمان بە میتۆدو بەرهەمهێنانی جوداش دەبێت.. با ئازادی بدەینە منداڵەکانمان ئارەزومەندانە کار بۆ دروستکردنی پرۆگرامی مندالآنە.. بە کردەوە مندالآنە بکەن.. ترسی گەورەکانیش بشکێنین ببنە منداڵیکی بچوک لەهەلسوکەوت.. واتە گۆران لە شێوازی قسەکردن و پێشکەشکردنی بەرنامەکانی مندالآنمان بکەین.

زۆر گرینگە بۆ ئەم مەبەستە سەیری هەندێک لە پرۆگرامە گرینگەکانی مندالآن لەتەلەڤزیۆنە بەناوبانگەکان بکەین.. با چاولێکەرێکی داهێنەر بین.. با سادەو دوور لە خۆ بەگەورە نیشان دەر بین، بۆ پێکهێنانی کەشێکی ئاسودە و فێرکردنی مندالآن بە رێگەی نوێ و سود بەخش. لێرەوە دەچینە نێو باسەکەمان کە بریتییە لە شاشەی گەورە و منداڵی چکۆلە.. بۆیە شاشەی گەورە، چونکە ئەمرۆ هەرتەنیا تەلەڤیزیۆن رۆل لەسەر گەشەپێدانی مندالان ناگێرێت، بەلکە کۆمیۆتەرو ڤیدیۆو سینەماو گەمەی ڤیدیۆو کەرەستەکانی تری میدیاش راستەوخۆ بەشداری لە گۆڕانکاری سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی مندالآن دەکەن.

(١)

## منداڵان چۆن دەژین

لەم بەشەدا دەمەوێت هەندێک ئاماژەی خێرا بێخمە سەر چۆنیەتی ژیان و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی مندالان لەچەند کۆمەلگایەکی جودا لە پێکهاتەی کۆمەلگای کوردستانی. چونکە ئەمە نیشانی دەدات کە دەکرێت بەسود وەرگرتن لە لێکۆلینەوە گرینگەکانی دونیا، ڕێگەی تایبەت بەهەلومەرجی خۆشمان بۆ مامەلەکردن دەگەل کێشەی منداڵان و چۆنیەتی بەکارهێنانی تەلەڤیزیۆن میدیا هەبێت.

لەئوستراليدا منداڵان کاتێکی درێژ لە خانەی سەرپەرشتی دەمێننەوە، چونکە لەلایەک دایکو باوکیان لەدەست داوە، یاکێشەی خێزانی لەنێوان دایک و باوک هەیە، یا هەردوو کەس لەخێزاندا رۆژانە بۆ ماوەی کاتژمێری زۆرو درێژ لەدەرەوە کار دەکەن. سەرچاوەکان دەڵێن یەک لەچوار منداڵ لەگەڵ هیچێک لە دایک و باوکی خۆی ناژیت.

سەبارەت بەئەمەریکاش بارودۆخەکە هێندە باشتر نییە، لە ساڵی ٢٠٠٠ دا ٢٢%ی منداڵەکان تەنیا لەگەڵ دایکیان ژیاون و٤%یش

تەنیا لەگەل باوکی ژیاوە. هەروەسا ٤%ی تریش لەگەڵ هیچێکیان نەژیاوە. ساڵی ۲۰۰۰ لەئەمەریکا ٦٩%ی منداڵەکان لەگەل دایک وباوک پێکڕا ژیاون، کەچی ساڵی ۱۹۸۹ بەرێژەی ٧٧% بوو(٤). واتە رێژەی دابڕان و ژیان دەگەڵ دایک و باوک لەبەرزبوونەدایە. ئەمەش بۆ ژمارەیەک هۆکاری جودای وەکو جیابوونەوەو کاری قورس و باری ئابوری سەخت و بەکارهێنانی مادە بێهۆشکەرەکان و رێژەی زۆری مارەنەکردن لەنێوان پیاوو ژن، هەروەها باری تەندروستیش لەلایەکی تر هاوکاری بەیەکەوە ژیان لەنێو خێزان ناکات.

هەروەکو گوتمان سەرچاوە تەندروستییەکان ساڵانە ۹ ملیۆن کەسی گەورە لە ئەمەریکا دوچاری نەخۆشی دێت. منداڵ لەئەمەریکا وەزعی لەروی تەندروستی لە گەورەکان باشتر نییە، منداڵی تەمەن ٦- ۱۹ ساڵی بەرێژەی ۱٥% واتە ۹ ملیۆن منداڵ تووشی قەڵەوی بوون. ئەمەش لەدەرەنجامی ئەوە هاتووە کە ٧کەس لە ۱۰ یان لەئەمەریکا وەرزش ناکات، بەهۆی زۆر مژۆلی کاتەکانیان بەکارکردن.(٥)

لەسەرچاوە تەندروستییەکان دەربارەی ساڵی ۱۹۹۹دا ۲٥%ی منداڵانی ئەمەریکا بەهۆی زۆر دانیشتن لەبەردەم شاشەدا دوچاری قەڵەوی هاتوون، لەئالەکی تریشدا ئەم منداڵانە کەگەورەش دەبن، بەقەڵەوی دەمێننەوە. بۆیەشە ساڵی ۲۰۰۲ (سی دی سی) پرۆگرامێکی تایبەتی بۆ منداڵان لەروی تەندروستییەوە رێکخست بۆ چۆنیەتی ئاگاداربوون لە زیادکردنی کێش و دابەزاندنی قەڵەویان. ئەم سەرچاوەی سەرەوە ئاشکرای کردوە کە یەک لەچل منداڵی ئەمەریکا رۆژانە چوار کاتژمێر سەیری تەلەڤیزیۆن دەکەن و٢٧%ی قوتابیانی

پۆلی ٩تاکو ١٢ کەمتر لە نیوکاتژمێر لەرۆژێکدا وەرزش تەندروستانە دەکەن تەنیا پێنج رۆژ یاپتر لەهەفتەیکدا. هەروەها ناوەندی تەندروستی ئەمەریکی ئاشکرای کردووە کە منداڵی ساوا ناتوانن جیاوازی لەنێوان ئەوە بکەن چیان کردووەو چ شتێک راستەقینە بووە. (٦)

لەلایەکی تردا سەرچاوە نوێکان ئاماژە بەوە دەکەن کە گۆرانێکی سلبی زۆر لە بواری تەندروستی منداڵان، ئەگەر ئەمەریکا بەنمونە وەربگرین رویداوە، چونکە لەلایەک منداڵان خواردنی پڕ لەچەوری و شیرنی زۆر دەخۆن و هەروەها بایەخ بە وەرزش و ولانەوە کەم دەدەن و ماوەیەکی درێژیش رۆژانە لەبەردەم شاشەی میدیا جوداکان بەسەر دەبەن، بەتایبەتیش شاشەی سەرسوڕهێنەری تەلەڤیزیۆن. جێفرری کلوگەر لەلێکۆلینەوەکدا لە گۆڤاری تایمز گوتیەتی: زۆربەی چالاکییەکانی منداڵان کە رۆژانە ئەنجامی دەدەن، ناتوانن بەرگەی رەشەبای ئەو خواردنە خراپانە بگرن کەهەموو رۆژێک بۆیان دێت. ئەوەتە بەبەراورد دەرکەوتووە منداڵانی تەمەن ٦-١١ساڵی، لە ساڵی ١٩٧١ تەنیا ٤% تووشی نەخۆشیەکانی قەڵەوی بووبن کەچی ساڵی ٢٠٠٤ رێژەی دوجارهاتنی نەخۆشیەکانی قەڵەوی گەیشتۆتە رێژەی ١٨.٨%. دیارە ئەم گۆرانکارییە سلبییە لە تەمەنی نێوان ١٢-١٩ بەرێژەی ٦.١% بەرزبۆتەوە بۆ ١٧.٤%، هەروەسا لەتەمەنی ٢-٥سالێش لە رێژەی ٥% بەرزبۆتەوە بۆ رێژەی ١٣.٩%.

هەمان bryan walsh لە هەمان سەرچاوە ئاماژەی بەوە کردووە کە سەرچاوە تایبەتییەکان پەروەردە ئاماژەیان بەوە کردووە کە ساڵی ٢٠٠٦ ٣٠.٧% منداڵە سپییەکانی ئەمەریکا کەلەتەمەنی چوونە

قوتابخانەن کێشیان لەسەروی کێشی ئاساییەو دوچاری نەخۆشی قەڵەوی هاوتوون. هەروەسا ٣٤.٩% منداڵی رەش و مەکسیکیەکانی ئەمەریکا دوچاری هەمان کێشەی تەندروستی هاتوون.(٧) . دیارە ئەمەریکییەکان لە روی داهاتەوە جیاوازی زۆریان هەیەو بەپێی سەرچاوەکانیش ریژەی جودایی داهاتەکان کاریگەری سلبیان لەسەر ژیانو تەندروستی مندالان دروست کردووە، بریان والش لەمبارەوە گوتیەتی ٢٢.٤% مندالآن لەتەمەنی ١٠-١٧ ساڵی لەژێر هێلی داهاتی کەمدا دەژین کە بە ٢١.٢٠٠ $ سالآنە دادەنرێت. ئەمانە ئاساییە دوجاری نەخۆشییەکانی قەڵەوی ببن. هەروەها بپ پتر بەرجاورونی ئاماژە بەرێژەی ئەو مندالآنە دەکەین کە دوچاری قەڵەوی هاتوون لەهەندێک لە ویلایەتەکانی ئەمەریکا،ئەم زانیاریانە لەتەموزی ساڵی ٢٠٠٨ بڵاوکراونەتەوە. ئۆتا ٢١% و کۆلۆرادۆ ٢١% و واشنتەن ٤٠% و کەنتاکی % ٣٩. بۆ پتر رونکردنەوەو بەرجاورونی لەبارەی شوێنی ژیانیان و ئاستی بژیویان لەم چوار ویلایەتەدا ئامارەکان بەمجۆرە باسی شێوەو شوێنی ژیانی ئەم مندالآنە دەکەن کە دوچاری نەخۆشی قەڵەوی هاتوون. لە ئۆتا ٣٦% ئەم مندالآنە دوجاری قەڵەوی هاتوون لە شار دەژین و٣٠% کوڕەکانیش لە دیهاتەکان دەژین و لە کۆلۆرادۆشدا ٣٢%ی منداڵەکان لەشارو لە٤٩% منداڵە هەژارەکان لە دێهاتەلان ژیان بەسەردەبەن و لە واشنتەنیش ٥١٣یان سپی و٤٣%یشیان ئەوانی ترن بەگشتی وهەروەها ٤٢%یان کوڕو ٣٨%یان کچ. لە ویلایەتی کەنتاکیش ٦٨% مندالآن لە دێهاتەکان دەژین و ٤٨%یشیان منداڵە هەژارن و لە شار دەژین. واتە بەتێکڕایی دەتوانین نەخۆشیەکانی قەڵەوی مندالآن لە سەرجەم وڵاتە

یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ چوار نازنەی جودا دابەش بکرێت کە یەکەمیان لە تەنیا سێ ویلایەتدا ئەم ڕێژە دەدۆزینەوە کەکەمترینانە ئەویش ڕیژەی ٢١% – ٢٤ دەگرێتەوەو دووەمیش ١٥ ویلایەتدا ڕیژەی ٢٥%-٢٨ دەگرێتەوەو سێیەمیش لە ٢٢ ویلایەتدا ڕیژەی ٢٩% -٣٣ و چوارەمیش لە ٨ ویلایەتدا ٣٤% – ٤٠ دەبینرێت، کە بەبەرزترین ڕێژەی دوچاربووانی قەڵەوی دادەنرێت.

بەپێی لێکۆلینەوەکانی هەمان سەرچاوەی گۆڤاری تایمز کارۆلین سایری دەربارەی گۆڕانکاری لە جۆری خواردن وکاریگەری ئەم جۆرە خوارنە خێراو ساردو گەنیوانەی ئێستا بلاوە چەند کاریگەری لەسەر منداڵ و توشبوونی بە قەڵەوی هەیە بڵاوکردۆتەوە کە ئێمە تەنیا پوختەی کاریگەریەکانی ئاماژە پێدەکینەوە، کەهاتووە خواردنی نیوەڕۆ لە ساڵی ١٩٥٠دا کالۆریسی تێکڕا ٩٣٩ بەرێژەی ٣٩% و سۆدیەم ١٢٩١بەرێژەی ٥٧%و قەڵەوی ٣٣ گرام بەرێژەی ٤٤% بوو، کەچی خواردنی نیوەڕۆ قوتابیان لە ٢٠٠٨دا بەمجۆرەیە کالۆریس ١١٧٣ بەرێژەی ٤٩% و سۆدیەم ٢٠٦٤ بەرێژەی ٩٢% و قەڵەوی ٤٥.٤ گرام بەرێژەی ٦١%. ئەمانە ئاماژەمان پێکرد پرۆگرامی خواردنی منداڵان دەگرێتەوە لە قوتابخانەکاندا. کە وەکو دەبینن گۆرانێکی سلبی زۆری بەسەردا هاتووە، بۆیە زۆرجاران لەراگەیاندا باسی داواکری گۆڕانکاری لە جۆری ئەو خورادنانە دەکەن پێی دەڵێن (جەنک فوود) دەکرێت من ناوی بنێم خواردنی گەنیو.. واتە ئەو خۆراکانەی زیان بە تەندروستی بەکارهێنەرەکان دەگەینن، لەوەی سودیان پێبگەیەنن.

لە باسی ترسناکی خواردن و دانیشتن بەدیار شاشەی تەلەڤیزیۆنەوە دیڤید بژێرکلیی هەولدەدات لە گۆڤاری تایمزدا کە

دۆسیەکی تایبەت بە قەڵەوی مندالانی تێدا ئامادەکراوە، ڕێگە نیشانی خێزانەکان بدات بۆ ئەوەی هاوکاری منداڵان بکەن، تا لەترسی قەلەوبوون کەم بکەنەوە ئەویش لەرێگەی پەنا بردنە ١٠ هەنگاو

یەکەم: دوور کەوتنەوە لەشاشە. واتە خێزان دەبێت خۆی بایەخ بەم بوارە بدات، هێندەک تەلەڤیزیۆن و شاشە جوداکان بکوژێنێتەوە.

دووەم: رۆیشتن بەپێ، کاریک بدۆزەوە بۆ ئەوەی منداڵەکە رۆژانە نزیکەی ١٠٠٠٠ پێ لەگەڵت بڕوات.

سێیەم: لێ گەڕێ منداڵ خۆی هەندێک لەجالاکی و گەمەکانی خۆی هەلبژێرێت و ئەنجامی بدات.

چوارەم: گەمەکانی خۆتی نیشان بدە وەکو وەرزش و یاخود سەماو هەلپەرکێ وشتی تر لەرێگەی ڤیدیۆو گوێگرتن لە مۆسیقا.

پێنجەم: هانی بدە، ری بهێنە، بۆنمونە دەتوانن بەکۆمەل لەنێوخێزاندا رکابەری بۆ ئەنجامدانی چەند چالاکیەک ئەنجام بدەن و هانیان بدەن بزانن کامەیان باشتو چاکتر یاری دەکەن.

شەشەم: راکردن بۆ چەند هەزار مەترێک.

حەوتەم: سواربوونی باسیکل و یاری تری لەمجۆرە.

هەشتەم: سەماکردن.

نۆیەم: سەیران و گەشتوگوزار، بۆنمونە لەسەرجەم ئەمەریکا نزیکەی ٤٠٠٠ باخچەو شوێنی گشتی حکومی هەیە، کە بۆ بەسەر بردنی کاتی پشوو، یاخود پشوی هەفتە دروست کراون.

دەیەم: گەمەی هەمەجۆر، دەتوانیت لەرێگەی یاری چاوشارکانێ و خۆشاردنەوەو پشتەرەقێ و هی تر یاری منداڵان ئەنجام بدرێت.

بۆ هەندێک گۆرانکاری دروستکردن لە جۆری خواردنی منداڵان لەئەمەریکا حکومەتی فیدرال کاردەکات لەرێگەی کۆمیسیۆنی تایبەتی بەمبوارە کەناوی (ئێف تی کەیە). داوا لە کۆمپانیاکانی خواردنی منداڵان دەکەن چاکسازی لەجۆری خواردنی منداڵان بکەن، کە ساڵانە سەدان ملیۆن دۆلار لەم خواردنانە قازانج دەکەن. نیۆرک تایمز لە وتارێکیدا بەناوی شەڕێ سەختی بازاری خورادنی منداڵان نوسیویەتی: ساڵی ٢٠٠٦ خۆراکی لەمجۆرە بۆ منداڵان لە بازارەکانی ئەمەریکا بایی ١.٦ بلیۆن دۆلار بووە. ئێستا کۆمپانیاکانی وەکو

Campbell soup , Cadbury Adams, kellogg's, burger King, General Mills, McDonals's, Coca Cola,Hershy, Kraft Foods, Mars and Unilever

چاکسازی لە پرۆگرامەکانیان بۆ خواردن بکەن.سەرچاوەکەی فیدرال رایگەیاندووە کە سالی ٢٠٠٦ چلو چوار کۆمپانی کە هی خواردن و خواردنەوەن. دەزانرێت کە ٨٧٠ ملیۆن دۆلار ساڵانە لای منداڵانی خوارووی تەمەن ١٢ ساڵی و١ بیلۆن دۆڵار بۆ هەرزەکاران.(٨)

بەم شێوەیە دەتوانرێت لایەنێکی چکۆلەی ژیانی منداڵان و ئەو هۆکارانەی منداڵ دوجاری نەخۆشی دەکەن لێکدەینەوە بەتایبەتیش ئەو نەخۆشیانەی لەرێگەی زۆر دانیشتن و خۆ ونکردن لە سایەی شاشەی میدیا جیاکانەوە دێنە ئاراوە.

ئەم پێشەکییە کورتەمان بۆ ئەوە بوو تا بزانین کە پێکهاتەی کۆمەلایەتی و تەندرستی منداڵان لە وڵاتێکی گەشەکردووی وەکو

ئەمەریکا چۆنە. لەتەک هەموو بایەخەی ئێستا بە پرۆگرام و بەرنامە جوداکانی منداڵان لەروی خۆشی وپەروەردەیی هەیە، منداڵان لەهەمان کاتدا روبەروی کۆمەلێک کێشەو گرفتی هەمەلایەنەن. بۆیە ئاساییە پرۆگرامەکانیشان نزیک بێت لەهەلومەرجە کۆمەڵایەتییەی تێیدا دەژین. کە ئێمە بەمجۆرەو شێوە روبەروی هەمان کێشەو گرفت نەبووینەتەوە.

وەکو گوتمان تەلەڤیزۆن بێ سانسۆرو لێکدانەوەو پێشگرتن لەهەموو ماڵێکدایەو پرس بەکەسیشمان ناکات، کەلەپەنجەرە داخراوەکانماندا دێتە ژوورەوە. تەنیا تەلەڤیزیۆن دونای وێک هێناوەتەوەو سنورە جوگرافیاییەکانی نەهێشتووە. زۆر لەو پرۆگرامانەی ئێستا لە کەنالە جوداکانی میدیای ئەمەریکی و بۆ منداڵانی ئەمەریکی دروست کراون وبەرهەمهێنراون، هەموو منداڵانی دونیا دەتوانن ببیین و بەشداری لە زەوق وەرگرتن و فێربوون لەهەمان کاتیشدا روبەروبوونەوەی کێشەکانیش بکەن.

بەڵام ئێمە چۆن دۆبلاج یان کۆپی بەشێک لەو فیلم و پرۆگرمانەی منداڵان دەکەین، کە بۆ باری کۆمەلایەتی جودا نووسراون و ئامادەکراون.. پێکهاتەی کۆمەلایەتی و تەندروستی و باری ژیان وئابوری خێزانی کوردستان جیاوازە لە هینی ئەمەریکی. بۆ نمونە گۆرانیان هەیە دەربارەی ئەو منداڵانەی دەگەڵ دایکو باوێک بەتەنیا ناژین، بەلکە دوو دایک، یا دوو باوکی هەیە، یا زیاتر.. کەئەمە لەسیستەمی کۆمەلایەتی و خێزانداری ئەمەریکی کارێکی ئاساییە، چونکە زۆر کەس بەیەکەوە دەژین و منداڵیشیان هەیەو یەکتریان مارەنەکردووە، یا لێک جودا بووینەتەوەو دۆستی نوێیان بۆخۆیان پەیدا کردووە. گۆرانیەکە بۆ راهێنانی منداڵە لەسەر (فرە دایکی وباوکی).. کە دوور نییە منداڵی ئێمە ئەمە فرە حیزبی بچوێنن. یاخود شەرو ناکۆکی و

داکۆکی کردن لەخۆو هتد. هەتا فیلمە دۆبلاجکراوەکانیش، پێوسیتان بەوردەکاری و لێکدانەوەی هەمەلایەنە هەیە.

بەلام دوور نییە ئێمە کێشەی تری منداڵانمان هەبێت.. نەخۆشی و لاوازی و کەمخوێنی و کەمخۆراکی هتد.. ئایا لە حالەتەی وەهاد اچ جۆرە بەرهەمێکی رۆشنبیری لە میدیای کوردی بۆ منداڵان بەرهەم دەهێنرێت. واتە مەبەست ئەوەیە، هەرچەندە خاڵ و هەندێک بۆچوونی هاوبەش و پێکچوو لەنیوان سەرجەم مندالانی دونیا هەیە، بەلام مەرج نییە هەمان کێشەو پێکچوونی کۆمەلایەتی و ئابوری و دەرونیان هەبێت، چونکە منداڵیک جودای دەگەڵ منداڵێکی تر هەیە، کە بێگومان ئەم جیاوازییە کە دەگاتە ئاستی کۆمەلگا جوداکان هەمەجۆری و رەنگی و نێوەرۆکی و هەلوێستیش بەخۆوە دەبینن.

لەمبارەوە دەکرێت منداڵ لەسەر بەرنامەی کۆمەلایەتی و تەندروستی رابهێنرێت.. ئەو بەرنامەی نەک تەنیا منداڵ بەلکە هاوکاری خێزان و قوتابخانەش دەکات. بۆنمونە گوتمان رێژەیەکی زۆری منداڵان دوچاری کێشی نائاسایی دێن. لەروی کۆمەلایەتییەوە بەشێوەیەکی ئاسایی منداڵی قەڵەو دەچێتە قوتابخانەو گەرەک بێ ئەوەی روبەروی شەرم و گالتە پیکردن بکرێتەوە، کەچی دوور نییە ئەمجۆرە مندالانە بکرێنە جێگەی سەرنج و گالتە پیکردن لەکۆمەلگای ئێمە.. واتە پرۆگرامەکانمان دەبێت لەتەلەڤیزیۆن لەسەر بنەمای نەهێشتنی جودایی لە شێوەو زارو دین ورەنگ وکێش و قەوارەو تد بێت.. بێ ئەوەی بە منداڵ بڵێن وریا بن ئێمە باسی ئەم کێشە!! گەورانەتان بۆ بکەین. ئێمە نابێت ناوی بنێن کێشەی کۆمەلایەتی، بەلکە وەکو رۆتین و شتێکی باوی ئاسایی باس دەکرێت. تا سەرنجی هەموو لایەک کەسانی تووش بوو بەنەخۆشی و کەموکورتی و

نارێکی، ئەوانەی لەدەوربەریان دەژین بۆ باری ئاسایی و رونەدانی هیچ شتێکی نارێکی کۆمەلایەتی رابکێشین. ئەمە لەباری جیاوازی کۆمەلایەتی وئابوری و تەمەن و کێش و کێشەی تەندروستیش بەهەمان شێوە دەبێت.

بۆیە لە کاتێکدا دەرگامان دادەخین و لەپەنجەرەکانەوە تەلەڤیزیۆن لە لێشاو کەلچەرێکی بالاتر لەخۆمان و تیژتر لە هەلسوکەتمان و گەرمتر لە بیرکردنەوەکانمان پێشکەش دەکات، دەبێت بەخۆ بکەوین تا رێگەی گونجاویش بۆ ئەم کێشە دیارانە بدۆزینەوە کە مندالّی کوردستان پێویستیان بە چارەسەرو بەشداری تێداکردن هەیە.

من دلّنیام مندالانی کوردستان نێوی بەشی زۆری فیلمە کارتۆنی و سینەماییەکانی ئەمەریکا دەزانن، ئەگەر هەمووشیان سەیر نەکردبێت ولە تەواوی زمانەکەش نەگەیشتبن، تامەزرۆی ئەوەن دوبارەو سێ بارە سەیریان بکەنەوە. چونکە بەرنامەکان هەر باسی روداوو بەسەرهاتەکان ناکات، بەلکو جولەیەکی ئێجگار زۆرو رەنگی زۆرو دەنگی سەرنجکێشی بەهێزو وێنەی هونەری گرینگ و روداوی بەتام و هەست بزوێنیشیان تێدایە. واتە مندالّ هەر بەتەنیا سەیری شاشەی گەورەی تەلەڤیزیۆن ناکات، بەلکو هەست ونەستی دەجولێت وبیریش دەکاتەوەودوور نییە بشپرسێت، ئەگەر شەرممان لێنەکات.

مەبەست ئەوەیە، کارەکانی میدیای کوردی پێویستیان بە لێکۆلینەوەی هەمەلایەنە هەیە.. تا بتوانرێت بەرهەمی گونجاوو لەبار پێشکەش بکات. یاخود چاکترە بلّێم لەرێگەی دامودەزگاکان لێکۆلینەوەیان بۆ بکرێت، نەک تەنیا پشت بە تواناو مەزاج و لێکدانەوەی تاکەکەسی ببەستێت.. پێویستە خودی مندالّ وەکو کێشەو روداوو هەست لەنیو پرۆگرامەکاندا کاربکات و بەرجەستە بکرێت.

(٢)

# تەلەڤیزیۆن و ئەرکی  ئێمە

نامەوێت وەکو پەروەردەکارێک شتەکان بنووسم، بەلکە دەمەوێت لەروانگەیەکی رۆشنیری و سۆسیۆلۆژی راگەیاندنەوە لە پەیوەندییەکانی نێوان تەلەڤیزیۆن و منداڵ بدوێم. ئەو کاریگەریانەی راستەوخۆ دوای دروستکردنی و بڵاوبوونەوەی ئەم شاشە سەیرو پڕ جولەو بزاڤە هاتە ئاراوە. لە دوای بەکارهێنانی تەلەڤیزیۆن بۆ ماوەیەکی کورت، ساڵی ١٩٦٥ رێکخراوی یۆنسکۆ  راگەیاندراوێکی دەربارەی  لێکۆلینەوەی کاریگەری تەلەڤیزیۆن لەسەر منداڵ بلاوکردەوە. دوای ئەوە دەست کرا بە لێکۆلینەوەی زانستی دەربارەی ئەم کێشەو کاریگەریەکانی لەسەر منداڵان.  دیارە لەگەڵ پەرەسەندن و فراوان بوونی کاریگەریەکان بوارەکانی لێکۆلینەوەکانیش لەئاستە جوداکان فراونتر بوون.

لێکلۆلەرەوە دیارەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەمجۆرە باسانە وەکو مەسەلەیەکی سۆسیۆلۆژی دەردەکەون لیکۆلینەوە لەمەڕ دەرخستنی هۆکارەکانی ئەم کێشانە دەکەن، چونکە تەلەڤیزیۆن لەروانگەی ئەم بۆچوونە سۆسیۆلۆژیایە وەکو موخەدەراتە، بەرەو داتەپین و کەمبوونەوەی پێ بەپێی ئیدارەو گیانی رەخنەگرتن دەبات، ماندووبوونی قوربانی و هاندانی توندوتیژی پەرەدەگرێت، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە سزای چاودێری و ئاراستەکردن دەربازی دەبێت. فیلم و زنجیرە تەلەڤیزیۆنییەکان ژیانی رۆژانەیان داگیرکردووە، لەئەنجامیشدا سنوری نێوان خەیاڵی تەلەڤیزیۆن و دونیای راستەقینە بە شەفافیەتەکەی جیادەکرێتەوە(٩).

بێگومان رۆلی سینەماش لەم بوارە لەهی تەلەڤیزیۆن کەمتر نییە، چونکە ئێمە دەزانین ئێستا سینەما چ رۆلێک لەبەرهەمهێنانی فیلمی توندتیژی و هەروەسا فیلمی کارتۆنی و تایبەت بەمندالان دەگێڕیت. دیارە ئەوانەش پەیوەندیان بە پیشەسازی و بازرگانی هۆلیۆدەوە هەیە، پەنا وەبەر بە وێنەو دەنگ و رەنگی هەمەجۆری سەرنج کێش دەبەن، تاکو زۆرترین کڕیارو بینەر بۆ بەرهەمەکانیان پەیدا بکەن. راستە ئێمە لەکوردستاندا نەگەیشتونەیتە ئەم ئاستەو سینەماکانمان لەململانێ دەگەڵ تەلەڤیزیۆن نین، بەلکە تەلەڤیزیۆن بەهۆی پەخشکردنی زۆربەی فیلم و بەرنامە بڵاوەکانی نێو بازارەکانی کوردستان، شوێنی سینەمای گرتۆتەوە، بەلاَم لە وڵاتە پێشکەوتووەکان و ئەمەریکا بەتایبەتی سینەما رۆلێکی گرینگ دەگێڕێت و سەدان هەزار منداڵ بۆ بینینی فیلمە تایبەتییەکانی مندالاَن رو لە هۆلەکانی سینەما دەکەن، یا لە رێگەی سی دی و ڤیدیۆو

کۆمپیۆتەرەوە سەیری نوێترین بەرهەمی منداڵان دەکەن.

لەبیرمان نەچێت بەشێکی زۆری فیلمەکان بەرهەمی گەمەی ڤیدۆ و پلەی ستەیشن و ئێکس باکس و گەیم بۆی و تد لێدروست دەکرێت، کە پڕیەتی لە توندوتیژی و کوشتن و شەڕو لێکدان و ئازار، تەنیا کاریکی سلبی لەسەر مێشک و دەروونی منداڵان دەکات، منداڵ دوچاری لەبیرکردن و هەلچوون و گەمژەیی و گوێپێنەدان و دوور کەوتنە لە پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ هاوڕیکانی و دابڕان و گۆشەگیری دەبات. تەنیا لێکلینەوە زانستیەکان دەریان خستووە ئەمجۆرە گەمانە کاریگەریان لەسەر تەندروستی منداڵیش هەیە.

بۆیە بایەخدان بە باری سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی منداڵ و ئەو کاریگەریانەی لە ریگەی تەلەڤیزیۆنە دروست دەبن، بۆ دوارۆژی منداڵان زۆر گرینگە. نابێت لەبیرمان بچێت تەلەڤیزیۆن و میدیا بە شێوەیەکی گشتی ناکرێت بکرێتە سەرچاوەی یەکەمین بۆ پێگەیاندنی ابری رۆشنبیری منداڵان، بەڵام دەکرێت لایەنە پارێزراوو دڵنیاکەرەوەکانی بەکاربهێنرێت، چونکە شاشەی گەورەی میدیا کە ئێستا لەرێگەی ئەنتەرنێتەوە زۆر خێراو فراوان بووە، نەک دونیای وێک هێناوەتەوە، بەلکە منداڵانیشی بە زۆر شتی بێ سانسۆرو چاوەدێرو پرۆگرامی جیاجیا ئاشنا کردووە، تەنیا گەلێک جاران هەوالی روداوی رفاندن و کارتێکردنی منداڵان لەروی سیکسی لەرێگەی ئەنتەرنێتەوە دەبیستین. بۆیەشە کاریگەری سۆسیۆلۆژیا دەگەڵ گەورەبوونی رۆلی ئەم شاشە لەسەر منداڵانی بچوک رۆژ بەرۆژ فراوانتر دەبێت. بۆیەشە ئاساییە لەژێر کاریگەری ئەمجۆرە لێکدانەوانە کەسانی وەکو فرانسوا مارییە و سیلکولین رویال لە

کتێبەکەیان کەساڵی ١٩٨٩ بلاویان کردۆتەوە دوچاری هەلوێستێکی لێکجودا لەمەڕ تەلەڤیزیۆن بکەن. کەهەلوێستی یەکەمیان داوا دەکەن منداڵ سەیری تەلەڤیزیۆن بکەن. هەلوێستی دووەمیشیان وریابن لەسەیرکردنی تەلەڤیزیۆن(١٠).

ئەمجۆرە بۆچوونانە لەدەرەنجامی کاریگەری تەلەڤیزیۆنە هاتووە، بۆیە ناچار دەبین بە دوو شێوە لێکدانەوە بۆ شاشەی گەورە بکرێت. مامۆستا لەقوتابخانە چۆن لەکاریگەری تەلەڤیزیۆن دەڕوانێت کاتێک دەبینێت منداڵ هەمان ئەو وشەو جولەو ئەکتانە دوبارە دەکەنەوە، کە پێشتر لەتەلەڤیزیۆن بینویانە، دیارە بۆ منداڵ ئاسانترە بۆ نیشاندانی هێزو تواناو داهێنانەکانی خۆی و دەرخستنی کەسێتی خۆی لەپێش هاورێ هاوپۆلەکانی کارێکی وەها بکات، کە دەبێتە جێگەی سەرنج، بۆیە لایەنە خراپەکەی کاریگەری تەلەڤیزیۆن دوبارە دەکاتەوە. ئەمەش بۆ مامۆستا دەردەکەوێت کە رۆلی سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی ئەم پرۆگرامانە چەندە خراپ و کاریگەرن، هەروەها مامۆستا تووشی سەرسورمان دێت کاتێک منداڵێک لەرێگەی سەیرکردنی بەرنامە پەروەردەییەکان زانیاری زۆری دەربارەی سروشت وگیانەوەرو ژیانی مرۆڤ و تد هەیە، کە رەنگە هی تەمەنی لەخۆی گەورەتریش بێت. واتە تەلەڤیزیۆن هەر تەنیا ترس نییە، بەلکە زانیاری و پەروەردەشە ئەگەر بتوانرێت بە گونجاوی بەکاربهێنرێت.

بەپێی لێکۆلینەوەکانی لەفەرەنسا سازدراون کاریان کردووە بۆئەوەی بزانن لەهەر ماڵێکدا چەند کەس تەلەڤیزیۆن بەکاردەهێنن و چەندجاران تەلەڤیزیۆنەکە (پێدەکەن،دەکوژێننەوە، کەنالەکان دەگۆڕن). هەتا دەتوانن بزانن لەرێگەی ئامێرە ئەلەکترۆنییەکان بزانن چەند

کەس لەماڵێک وهەتا ژورێکدا هەیە. بێگومان لەئەمەریکاشدا کۆمپانییەکان کاتێک هێلی تەلەڤیزیۆنیان لێدەکرێت، لێت دەپرسن چەند تەلەڤیزیۆن لەماڵەوە بەکاردەهێنیت. بۆئەوەی هێلی بۆ دابین بکەن. گرینگ ئاستەکانی تەکنەلۆژیا زۆر پێشکەوتوون، لەهەمان کاتیشدا رێگاکانی لێکۆلینەوەش گەشەکردنی بەخۆیەوە بینیوە.

لەلایەکی تر دەرکەوتووە ئەو خێزانانەی منداڵیان لە نێوان تەمەنی ٨ تاکو ١٦ ساڵی هەیە، بە رێژەی %٩٦ تەلەڤیزیۆنیان لەماڵەوە هەیە، پتر لەنیوەشیان پتر لەیەک شاشەیان لەماڵەوە هەیەو پتر لە چارەگێکیانیش ئامێری ڤیدیۆیان هەیە. سالآنە بەشێوەیەکی مام ناوەندی ٨٠٤ کاتژمێر سەیری تەلەڤیزیۆن دەکەن. ئەمە سەبارەت بەمنداڵی تەمەن نیوان ٦-١٠ ساڵی. واتە نزیکەی ٢ کاتژمیر لە رۆژێکدا. بەلآم سەبارەت بە منداڵی تەمەن ١١-١٤ ساڵی گەیشتۆتە ٨٧١ کاتژمێر لە ساڵیکدا. واتە بە تێکڕایی نزیکەی ٢کاتژمێرو پانزدە خولەک لە رۆژێکدا سەیری تەلەڤیزیۆن دەکەن. ئەمە سەبارەت بە فەرەنسا لە ساڵی ١٩٨٩(١١). بە دڵنیاییەوە ئەم رێژەیە لە ولآتە جیاکان گۆرانی بەسەر دادێت. لەئەمەریکا لەوە پترە، تەنیا وەکو لە بەشەکانی تر ئاماژەی پێدەکەین، بەهۆی زۆربەکارهێنانی تەلەڤیزیۆن لەلایەن مندالان لەئەمەریکا، منداڵ دوچاری نەخۆشی و تیکچوونی باری تەندروستی و سۆسۆلۆژی و سایکۆلۆژیش دێن.

لەم دوو خشتەی خوارەوەدا رێژەکانی سەیرکردنی تەلەڤییۆن لە پێنج کەنالی فەرەنسی ئیم ٦ وئیل ئای٥ و ئێف ئاڕ٣ وئای ٢ و تی ئێف ١ نیشان دەدات. هەروەها بایەخی گرینگدانی مندالآن نیشان دەدات کە لەکاتی سەیرکردنی تەلەڤیزیۆن لایان دروست دەبێت.

| منداڵی تەمەن ٦-١٤ ساڵی کە پتر لە دوو کاتژمیر سەیری کەناڵە جوداکان دەکەن | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | تی ئێف ١ | ئای ٢ | ئی ئار ٣ | سی + | پێل ئای ٥ | ئێم ٦ |
| ٦-١٠ ساڵی | ٣٥٢ | ١٣١ | ٩٥ | ٣٠ | ١٤٧ | ٤٩ |
| ١١- ١٤ساڵی | ٣٥٢ | ١٦٠ | ٩٥ | ٣٠ | ١٥٧ | ٨٤ |

| جۆری فیلم | تەمەنی ٦-١٠ ساڵی | ١١-١٤ساڵی |
|---|---|---|
| خەیاڵ | ٣٤% | ٤٢% |
| فیلم | ٦% | ٨% |
| فیلمی تەلەڤیزیۆنی | ٤ | ٨ |
| معلقات | ٢٤ | ٢٨ |
| یاری و هەمەجۆر | ١٥ | ١٦ |
| فیلمی بەجولە | ٢٦ | ١٦ |
| زانیاری | ٩ | ٩ |
| وەرزش | ٣ | ٣ |
| ریکلام | ٦ | ٦ |
| بەرنامەی تر | ٧ | ٨ |
| ١٠٠%کاتژمێر | ٧٧٤ | ٨٣٨ |

ئەم سەرچاوەیە دەریدەخات کە بایەخدان بە فیلمی جولەدار لای منداڵان لە بەرنامەکانی تر پترە،پتر لە ٢٥%ی منداڵانی تەمەن٦-١٠ساڵی سەیری ئەم پرۆگرامە دەکەن و بەرێژەی ٨٥%یش ئەوانەی تەمەنیان لەنێوان ١١-١٤ ساڵی. هەروەها جیاوازی کەنالەکانیش دەردەکەون، کەمنداڵ کامەیانی پێ خۆشترەو پتر سەیری دەکات.

هەروەها لەلێکۆلینەوەیەکدا دەربارەی جۆری بەرنامەکان لای منداڵانی ٨-١٦ ساڵی و رێژەی لایەنگرانی بەرنامەکان بەمجۆرهە دەرکەوتووە: ٦٧% گوتیانە حەزیان لە فیلمەو ٦٣%یش گوتویانە حەزیان گیانەوەرانەو٥٣%ش هەمەرەنگ و ٥٢%ش یاری وزینجیرەکانیش بە رێژەی ٥٢%و بەرنامەی وەرزیشی ٥١%و فیلمە جولەدارەکانیش ٥٧%. (١٢)

لێرەدا دەکرێت بایەخی تەلەڤیزیۆن وەکو پیکهاتەیەکی سۆسیۆلۆژی و کاریگەریەکانی لەسەر منداڵان سەیر بکەین، لەکاتێکدا ئێمە دەزانین کە ئەمجۆرە لێکۆلینەوانەش هێشتا نەگەیشتونەتە خاڵیکی کۆتاو دایریکراو، چونکە باری سایکۆلۆژی بەرهەمەکانی راگەیاندن و پێکهاتەی سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی منداڵان گۆرانی بەسەر دادێت. لەکاتێکدا کاریگەرییەکانی شاشەی تەلەڤیزیۆن گەورەو گەورەتر دەبن، چونکە ئێستا تەنیا یەکجۆرە شاشەمان بۆ چاودێری کردنی منداڵان نییە، بەلکە فرە شاشەیی پەیدابووە.

ئەرکی ئێمە وەکو بایەخدەرێک بە بواری سۆسیۆلۆژی راگەیاندنی منداڵان چییەو دەبێت چ بکرێت بۆ ئەوەی منداڵان بتوانن بە ئارامی و

گونجاوی سەیری پرۆگرامەکانی تەلەڤیزیۆن بکە. لەنیو راگەیاندن بەگشتیدا ناتوانرێت هەنگاو بنرێت ئەگەر زانیارییەکی دروست و رێک لەبەردەست نەبێت دەربارەی ئەو بوارانەی گەرەکە کاریان تێدا بکرێت، واتە پێویستە کارەکان لەسەر بنەمایەکی زانستی و لێکدراوە ئەنجام بدرێت و لە کارتێکردنی کەسێتی و هەلچووانەو مەزاج دوور بێت.

هەروەها زۆر گرینگە ئەوانەی لەم بوارانە کاردەکەن کەسانێکی لێوەشاوەو خاوەنی ئەزمون و لێهاتوویی تایبەت بە بواری منداڵان بن. چونکە کارێکی قورس و پڕ لەکێشە دەکرێت کاتێک بەرنامەکان دوور لە پێشینەی لێکدراوە لەلایەن کەسانی پسپۆر پەخش بکرێن.

هەروەسا بۆ پتر تێگەیشتن لە تەلەڤیزیۆن و سۆسیۆلۆژیای میدیا، پێویستە بایەخ بە سەرچاوەو لێکۆلینەوەی مەیدانی بدرێت. تاکو نزیکبکەوینەوە لە کێشەو خواست و ئارەزووەکانی منداڵان.

خێزان بایەخ بە گرینگی تەلەڤیزیۆن لەهەرتک ئالی ئەرێ ونەرێ بدەن، چونکە منداڵ بەتینو تاوێکی زۆرەوە دەیەوێت تیکەڵی پرۆگرامەکان بێت، بێ ئەوەی هیچ ئامادەکاری و خۆپارێزییەکی کۆمەلایەتی و دەروونی بۆ کرابێت. تەنیا زۆرجاران گەورەکانیش بەهۆی کاریگەری فیلمی توندوتیژی هەلسوکەوتی نادروست و نەشیاو ئەنجام دەدەن.

رەچاوی جۆرێک لەسانسۆرو جاپێداخشانەوە لەبەکارهێنانی کۆمیۆتەرو ئەنتەرنێت بکرێت، تاکو منداڵ رانەکێشرێتە نێو بوارەکانی توندوتیژی و هەتا تاوان و سێکس لەرێگەی ئازادانە بەکارهێنانی ئەنتەرنێت.

واتە پێش هەرشتێک پێویستیمان بە سۆسیۆلۆژیایەکی کراوەو

پاریزراو لەهەمبەر کارتیکردنە نەرێکان هەیە، ئەو سۆسیۆلۆژیایەی دەتوانێت ببێتە سەرچاوەیەکی رۆشنبیری گرینگ و لەهەمان کاتیشدا کار دەکات بۆ راگرتنی هاوسەنگی هەستو نەستی منداڵ و ئەو بارە سیکۆلۆژییەی کە لە دیماهیدا دەبێتە پێکهێنەری هاوسەنگی کەسایەتی نوێی منداڵ. چونکە زۆرجاران راگەیاندن دوور لە خواست و ئاراستەی ئێمەدا کەشێکی ترسناک دەخولقێنێت کە دواتر کۆنترۆل و سنوردارکردنی کارێکی قورس و پڕ کێشە دەبێت.

لێکۆلینەوەکان بەگشتی نیگەرانن لەهەمبەر زۆر بەکارهێنانی شاشەی گەورەو پر بزاڤ و جولەی ئەم تەکنەلۆژیا نوێیەی کە ئەمرۆ خێراییەکەی هێندە زۆر بووە، مرۆ دەتوانێت لەسایەیدا دوورابیەکی زۆر ببڕێت و لەکەمتر لە چرکەیەدا پەیوەندی بە رۆژهەڵات و رۆژئاوا بکەیت. واتە سنور نامێنێت و کات رۆلێکی هێندە گرینگی دەبێت کە خێراییەکەی لە بیرکردنەوەی ئێمە پترە. واتە لەکاتێکدا سنور لەبەردەم پەیوەندی و دووریی و کیشوەرەکان و کەسەکان نامێنێت، بایەخی کات و کاریگەرییە خێراو ترسەکانی کارتیکردن خێراترو خێراتر دەبن. بەمەش ئەو سۆسیۆلۆژیا کلاسیکەمان بەهانا نایێت، کە ترسەکانمان بەتەنیا نیشان دەدات، بەلکە خودی ئەو راگەیاندنە دەبێت سۆسیۆلۆژیای گۆڕانکاریمان بۆ دروست بکات، کە ئارامی و ئاسودەیی بە منداڵان دەبەخشێت.

(٣)

# میدیاو رۆشنبیری منداڵان

کاتێک بمانەوێت باسی میدیا بکەین دەبێت بیر لەو پرۆژەو پرۆگرامانە بکەینەوە کە تەلەڤیزیۆن پێشکەشی دەکات. هەروەها ئەو هۆکارو دەرەنجامانە ئاماژە پێبکەین کەدەبنە هاندەرو هاوکاری منداڵان. میدیا لەسەردەمی ئێستادا رۆلێکی گرینگ لەسەرجەم بوارەکانی گۆمەلگا دەبینێت و تەنیا لەزۆر روەوە تەنیا نەبۆتە دەسەڵات بەلکو بەشداری لەدەسەڵات دەکات و لەهەمان کاتیشدا چاودێرێکی گرینگ و جێگەی بایەخیشە بەسەر دەسەڵاتی جێبەجێکردن.

بێگومان ئەم رۆلە لەبواری بەرنامەو پرۆژەکانی منداڵانیشدا جێ پەنجەی دیارەو منداڵان بەتەنیا سەیرکەرو دواکەوتووی میدیا نین، لەسەردەمی تەکنەلۆژیاو کۆمپیۆتەرو ئەنتەرنێت، بەلکە خودی منداڵان بەشدارن و هاوبەشن لەسەرجەم ئەم پرۆگرامانەی بۆیان تەرخان کراوە.

کاتێک باسی میدیا دەکەین، بوارە هەمەجۆرەکانی وەکو تەلەڤیزیۆن و رادیۆو سینەماو شانۆو نواندن و رۆژنامەو گۆڤارو سەردان و لێکۆلینەوەو پرۆگرامی تایبەتی فێرکردن بەبیرخۆمان دێنینەوە. رۆشنبیری منداڵان دەنێو پرۆگرامەکاندا بەرچاوە.

بێگومان لەدونیای دواکەوتووی، منداڵ دابڕاو لە پێشکەوتنی سەردەمانە، منداڵ هێشتا گوێگرو جێبەجێکەری سەرەکی ئەو رۆشنبیرو دابونەریت و هەڵسوکەوتەیە کە گەورەکان بۆی دادەرێژن. وەلێ لە دونیای دیموکرات و پێشکەوتوودا منداڵان پێ بەپێی گەشەکردنیان پتر پتر بەشداری لە پرۆگرامەکان دەکەن، بەمەش جۆرێک لەرۆشنبیری منداڵانە بەرهەم دێنن، کە خێراترو سادەتر دەتوانن تێکەڵی بن و کاری پێبکەن.

ئێمە دەزانین تەلەڤیزیۆن داهێنراوێکی زۆر کۆن نییە، لەناوەراستی حەفتاکانی سەدەی بیستەمیشدا وەکو بەکارهێنراوێکی میللی کەوتە دەستی خەڵکی لەکوردستانی باشوردا. راستە ئەوکاتە خەڵکانێکی زۆر تەنیا لەرێگەی چایخانەو جایخانە چکۆلەکانی نێو گەرەکان ئاشنای تەلەڤیزیۆن بوون، بەلام ئەمە سەرەتای کەلچەرو رۆشنبیرییەکی تازە بوو. کارتۆن و بەرنامە تایبەتەکانی منداڵان، کەبەزمانی بێگانە بوون، و منداڵی کورد لەروی زمانەوە هیچی لێتێنەدەگەیشت، بەلام سەرەتایێکی گرینگ و جێگەی سەرنجی منداڵان بوو، کە دەیان بینی ئەم سندوقە پڕ سەیرو سەمەرەیە، هەست ونەستیان دەجولێنێت. تەنیا رژێمی داگیرکەری بەعس تا روخاش رێگەی نەدا فلیمە کارتۆنییەکانی منداڵان دۆبلاجی زمانی کوردی بکرێت.

ئەمرۆ لەرێگەی بەکارهێنانی شاشەی بچوکی ڤیدیۆو ئامرازەکانی

یاریکردن دەتوانرێت لەهەموو شوێنێک و کاتێک سەیری شاشەی ئەو تەلەڤیزیۆنە چکۆلانە بکرێت و دەگەڵیدا ئاشنا بیت. لە کاتی ئاودەست و سواری ترۆمبیل و پشودان لەباخچە گشتییەکان وتا دەگاتە کاتی سواربوونی فرۆکەش. ئەم رۆشنبیرییە تازەیە وا لەمنداڵ دەکات لەتەک خێرا گەشەکردنی ئامرازەکانی سەیرکردن و بەرهەمهێنانی میدیا، ئەویش ئاستی رۆشنبیری بەکارهێنان و تێگەیشتن و لەزەت وەرگرتن لەم پێشکەوتنەی پتر بێت.

لەکاتێکدا ئێمە بە شادییەوە سود لەم گەشەکردنەی میدیا لەبوارە هەمەجۆرەکان وەردەگرین و پێی شاد دەبین، دەبێت فێری ئەوەش بووین چۆن رێز لەم گەشەکردنە گرینگە بگرین، کە خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکات. گوتمان تەلەڤیزیۆن و ئامارەکانی تر ئەمرۆ لەهەموو شوێن و ماڵێکدا هەن، تەنیا لەشەقامە گشتیەکانیشدا دەبیرنێن و سەرنجیان بۆ رادەکێشرێت. مەبەست ئەوەیە، کە ئاستی بەکارهێنان و ئاشنابوون دەگەل میدیای سەردەم لەلایەن منداڵانەوە زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەو سەرەتایەی کە تەلەڤیزیۆن وەکو ختوکەدان دەگەڵیدا دەژیان.

میدیا ئەمرۆ پەیامێکی جیا لەسەردەمی رابردووی هەیە، کاردەکات منداڵان رابکێشیت بۆ ئەوەی بیرلەخۆیان بکەنەوە. واتە رۆشنبیرێک پیکبهێنن کە خۆیان وەکو بوونەوەرێکی کۆمەلایەتی تێدا بەشدار دەبن و ئەو کیان و کەشوهەوایە دروست دەکەن کە منداڵ خۆیان لەروی خودیەوە بەشداری تێدا دەکەن.

مەسەلە گەیشتۆتە ئاستێکی زۆر بەرز بۆ نمونە بەپێی سەرچاوەکان بەشێوەیەکی گشتی لەهەر ماڵێکی ئەمەریکدا رۆژانە ٧

کاتژمێر سەیری تەلەڤیزیۆن دەکەن. ٦٠% خێزانە ئەمەریکیەکان لەکاتی نان خواردندا سەیری تەلەڤیزیۆن دەکەن، بەتایبەتیش منداڵان لەتەمەنی ١٨ ساڵیدا لەکاتی نانی ئێوارە سەیری تەلەڤیزیۆن دەکەن. منداڵان دوقاتی ئەو کاتانەیان سەیری تەلەڤیزیۆن دەکەن لەوەی لەماوەی ١٢ ساڵدا لە قوتابخانە بەسەری دەبەن. هەمان سەرچاوە دەربارەی منداڵانی ئەمەریکا لە قۆناغی باخچەی ساواین و دایەندا دەڵێت ئەم منداڵانە پتر لەکاتی چوار ساڵی قوتابییەکی کۆلیژ کەبۆماوەی خوێندن تەرخانی کردووە، سەیری تەلەڤیزیۆن دەکەن.(١٣)

ئێستا گفتوگۆی زۆر لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی تەلەڤیزیۆن و بوارەکانی تری میدیا لەلایەن مندالانەوە دەکرێت، هەرچەندە مندالان ئاستی رۆشنبیریان لە بەرزبوونەوە دایەو گەشەکردنێکی خێرا بەخۆیانەوە دەبینن، بەلام ژمارەیەکی زۆری خێزانەکانە لەسەر ئەم بۆچوونە کۆکن، کەدەڵێت زۆربەکارهێنانی تەلەڤیزیۆن لەلایەن منداڵانەوە باش نییە.

فێرکردن و راهێنانی منداڵان لەسەر رۆشنبیری میدیا، جۆرێکە لە تواناولێهاتوویی، پێویستی بەکات و راهێنانی زۆرە. کاتێک منداڵ گەمەکانی نێو ئەنتەرنێت بەکاردەهێنێت و دەیەوێت دواین فیلمی هۆلیوود سەیر بکات و لەپرۆگرامە تازەکانی منداڵان دانەبڕێت و یاری بە ڤیدۆ گێیم و گێم بۆی و دی سی وهتد بکات، لەتەک پەرەسەندنی تواناو لێهاتووی و فرەبوونی رۆشنبیری لەبەکارهێنان و دۆزینەوەی بیرۆکەو شتی نوێ، روبەروی جۆرێک لەکاردانەوەو کێشەی رەوشتی (هەلسوکەوت و لاوازبوونی هەستی گوێگرتن و

بەدواداچوون وبایەخ پێدان دێت). بەلام ئەم رۆسنبیریە خاوەنی توانایە بۆ گەشەپێکردنی زمان و دەولەمەند بوون لەروی زاراوەو پەیوەندیکردن و دواندن و بیرکردنەوە.

ئێمە لەسەردەمی (بیرکردنەوەو گەشەکردن وبەشداریکردندا) دەژین، کاتێک میدیای کوردی لەم بیرکردنەوە دادەبڕێت ناتوانێت هاوتایی بۆ منداڵان لەنێوان شاشەی گەورەو بیرکردنەوەو هەست و نەستی منداڵ دروست بکات. ئەمەش کاتێک دێتە ئاراوە کە منداڵانی کورد توانیان خۆیان ببنە بەشێک لە پرگرام و بەرنامەکانی میدیا. واتە تەنیا گوێگری دوور لە بیرکردنەوە نەبن و توانای گەشەکردنیان لەرێگەی تێکەڵبوون دەگەڵ رۆشنبیری سەردەمانەی میدیای منداڵان رێرەوی ئاسایی خۆی وەربگرێت و دواتر بەرەو بەشداریکردن بچن.

لەبیرمان نەچێت رۆشنبیری خوێندنەوەو نووسین زۆر لە رۆشنبیری سەیرکردنی وێنەو بینینی شاشە گەروەو بچوکەکان جیایە. چۆنیەتی بەکارهێنان وتێگەیشتن و لێکدانەوەی شتە سەرنجکێشەکانی نێو ئەم تەکنەلۆژیایە نوێیە، لەکردەوەدا رۆشنبیری میدیایە. چونکە منداڵان لەم رێگەیەوە ئاستی بیرکردنەوەو تێگەیشتنیان بۆ بەکارهێنان وناسینی ئەمجۆرە میدیایە پەرە دەستێنیت.

دەبێت منداڵ فێری ئەوە بکرێن چۆن ئەم تەکنەلۆژیایە نوێیە بەکاردەهێنن، چونکە ئاشنایەتی لەلایەک و بەکارهێنانی میدیای سەردەم خۆی لەخۆیدا رۆشنبیرییە. لەکاتێکدا منداڵی کورد هێشتا نەبۆتە خودانی پرۆگرامی وەبەرهێنراوی تایبەتی خۆی، کەچی

دەتوانێت لەرێگەی ئەنتەرنێتەوە ئاگای لەزۆر بەرهەمی سینەمایی و تەلەڤیزیۆنی و چاپ وبلاوکراوەی جودای دونیا هەبێت، دەتوانێت دەگەڵ خەڵکی تر لەرێگەی ئەنتەرنێتەوە پەیوەندی بگرێت و قسەبکات و کامیریای ڤیدیۆی بۆ بینی یەکتر بەکاربهێنێت. بەکارهێنانی ئەم میدیا تازەیە خودی رۆشنبیرییەکی سەردەمانەیە، کە دەکرێت دەرگای دونیای جوداو هەمەرەنگ بەسەر مداڵاندا بکاتەوە، کە هێشتا بەزمانی زگماکی خۆیان بەرنامەی پەروەردەیی و فلیم و پرۆگرامی تەلەڤیزیۆنیان نییە.

(٤)

## کێشەی سەیرکردنی تەلەڤیزیۆن!

کاتێک باسی لایەنە سود بەخش و گرینگەکانی تەلەڤیزیۆن وڤیدیۆ لەپێگەیشتن و بەرزبوونەوەی ئاستی فێربوونی مداڵان دەکەین، لەهەمان گاڤیشدا ژمارەیەک کێشەو گرفتی فسیۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی بەدواوە دێت، کەپێوسیتە لەهەمبەریاندا وریاو بەدیقەت بین. زانستی تازە دەلێت ئەم میدیایە کاریگەری سلبی لەبواری گوێگرن و لیدانی دڵ و سیەکان و ماسولکەکان هەیە.

لەئەمەریکادا بەهۆی سەیرکردنی کاتی زۆری تەلەڤیزیۆن و دانیشتن بەدیار شاشەو گەمەکردنی ڤیدیۆ، راپۆرتە رەسمییەکان گوتویانە لەسەروی لە ٥٠%ی منداڵان لەتەمەنی قوتابخانە وەرزشی گەشەکردنی دڵ و سیەکانیان بەتەواوی نەکردووە. ٤٠% منداڵانی تەمەن ٥ تاکو ٨ ساڵیش لەم رێگەیەوە دوچاری کێشەی دڵ هاتوون. لایەنە زانستیەکان ئەمە بۆ زۆر سەیکردن و دانیشتن لەپێش

تەلەڤیزیۆن دەگێڕنەوە(١٤).

کێشەکە پەیوەندی بە باری تەندروستی منداڵ وبیرکردنەوەو هەلچوون و باری دەروونی منداڵەوە هەیە. ئێمە دەزانین منداڵ لەیاریکردن فێر دەبێت، بەڵام نەک بەتەنیا ئەمجۆرە یارییە، بەلکو پیویستی بە وەرزش و راکردن و هەلبەزودابەزو رۆیشتن و تیکەڵبوون دەگەڵ خەڵکی ترو گەمە مییللی منداڵانە هەیە. ئەمجۆرە بەردەوامییەی منداڵان بۆ سەیرکردنی تەلەڤیزیۆن و گەمەی ڤیدیۆ بۆ ماوەی دوورو درێژ، کاریگەری سلبی لەسەر باری تەندروستی منداڵان دەبێت. لێکۆلێنەوەکان دەریان خستوە کە ئەو منداڵانەی بۆ ماوەی کاتژمێری زۆرو بەبەردەوامی لەپێش تەلەڤیزۆن دادەنیشن و گەمەی ڤیدیۆ دەکەن خێرا تووشی نەخۆشی بەرزبوونەوەی رێژەی خوێن و قەڵەوی و نەخۆشی شەکر دێن. لێکۆلینەوەیەک لە زانکۆی کالیفۆرینا کەدەربارەی ١٠٩٧ منداڵ کراوە، دەریخستوە ئەو منداڵانەی بۆ ماوەی ٢ کاتژمیر یا پتر لە رۆژێکدا سەیری تەلەڤیزیۆن دەکەن، کە گەورەبوون دوچاری بەرزی رێژەی کلۆرستۆل دین(١٥).

لەلایەکی تردا لێکۆلینەوەکانی ئەمەریکا دەریان خستوە کە منداڵ کاتێک زۆر سەیری تەلەڤیزیۆن دەکات، رەنگە دوچاری نەخۆشی هەمەجۆر ببێتەوە، بەتایبەش ئەوانەی بەبەردەوامی و بۆ کاتی دوورو درێژ لەبەردەم شاشە دادەنیشن و ناجولێن. سەرچاوەکان ئاشکرایان کردووە ٢٦%منداڵان بۆ ماوەی ٤ کاتژمێر لەیەک رۆژدا سەیری تەلەڤیزیۆن دەکەن و٦٧%یشان بۆ ماوەی ٢کاتژمیر یا پتر سەیری تەلەڤیزیۆن لە رۆژێکدا دەکات و ٤٨%ی خێزانەکانیش لەماڵەوەدا سەرجاوەکانی راگەیاندنیان وەکو تەلەڤیزیۆن و کۆمیۆتەرو ڤیدیۆو

گەمەی ڤیدیۆیان هەیە. تەنیا ژوری نوستنی منداڵان لەسەدەی بیست ویەکدا گۆرانی بەسەر داهاتووەو لەئەمەریکادا بەرێژەی ٥٧% منداڵانی تەمەن ٩-١٣ ساڵی لەژوری نوستندا تەلەڤیزیۆنیان هەیەو ٣٩%ش گەمەی ڤیدیۆی هەیەو ٣٠%یشیان ئامێری ڤیدیۆی هەیەو ٢٠%یش کۆمپیۆتەرو ١١%ش سەرچاوەی ئەنتەرنێتی هەیە. (١٦)

میدیا لەتەک خۆشی بەخشین بەمنداڵان دوور نییە لەکاتی هەلە بەکارهێنانیشی ئازاریان بدات، بەتایبەتیش لەئەنجامی زۆرو بێ کۆنترۆل بەکارهێنانی. کورد گوتنەی (جام کەپڕ بوو لەسەری دەرژێتەوە)و یاخود وەکو باب وباپیرانمان گوتیانە (هەموو شت بەخوێ و خوێش بە مانا). یانی هەرشتێک بەکارهێنانەکەی لە سنوری ئاسایی خۆی دەرچوو، دوور نییە ببێتە هۆی زیان پێگەیاندن و بەجێهێشتنی لەکەو شتی خراپ بەسەر دوارۆژی بەکارهێنەرەکانی.

کاتێک منداڵ بۆ ماوەی بێ سنور بەسەیرکردنی تەلەڤیزیۆن و ڤیدیۆو فلیم و بەکارهێنانی گەمەی ڤیدیۆ خەریک دەبێت، هەر تەنیا دوچاری هەندێک نەخۆشی نابێت، بەلکە گەشەکردنی مێشکیش دوجاری جۆرێک لەسستی و خاوبوونەوە دێت. مێشکی کراوەو چالاک لەدەرەنجامی یاریکردن و وەرزشەوە دێت، توانای بیرکردنەوەو بڕیاردان و لێکدانەوەو جیاکردنەوەو کۆنترۆلکردنی خۆو هەڵسوکەوتی زۆر پترە، لەوانەی وەکو خەوالوێک زۆربەی کاتەکانیان بەدیار شاشەوە بەسەر دەبەن.

## بۆ مێشک و دڵێکی تەندروست

### منداڵەکەت بنێرە دەرەوە تاکو یاری بکات...
### هەڵپەڕێت و رابکات.... تا هەرچی توانای گەشەکردنی
### هەیەتی، بجولێت ..لەنەخۆشی دوور بێت...

وەرزشی تەندروستانە هاوکاری منداڵ دەکات هەستی خۆ کۆنترۆلکردنی لەنێو مێشکیدا دروست بکات .سەرباری بەهیزبوونی ماسولکەکانی لەش و گەشەکردنی بەشەکانی تری ئەندامی لەش بەشێوەیەکی سروشتی. بۆیەشە لە قوتابخانەکانی پێش دەستپێکردنی قۆناغی سەرەتایی لە جیاتی سەیرکردنی ڤیدیۆو تەلەڤیزیۆن لە ولاتە گەشەکردووەکانی باری پەروەردە لە نیو پۆڵدا چەند بەشێکیان بۆ فێربوون وخوێندن تەرخان کردووە، وەکو (بەشی هونەری وێنەکێشان، مۆسیقا، یاریکردن بەئاو، یاریکردن بەلم، دروستکردنی خانوو و کەلوپەلی بیناکردن، چێشتخانە) کەئەمانە هاوکاری گەشەکردنی مێشکی منداڵان دەکەن و لەهەمان کاتیشدا فێردەبن و یاریش دەکەن.

وەکو دکتۆر روسەل هارتەر دەربارەی پەیوەندی نێوان تەلەڤیزیۆن و مێشک گوتیەتی تەلەڤیزیۆن زۆر کاری سیمبۆلی نییە، وێنەکانی زۆر ئاسانن بۆ تێگەیشتن..(١٧). لەهەمان کاتدا لێکۆلینەوەکان دەلێن واچاکە منداڵ سەیری ئەم فیلمانە بکەن کە سیمبۆلی تێدایەو وادەکات منداڵان بیری لێبکەنەوەو لەم رێگەیەوە دەتوانن تواناکانیان بۆ جولانی مێشکیان بەکار بهێنن. بۆیەشە وێنەی سەر شاشەی تەلەڤیزیۆنەکان کە سانان بۆ تیگەیشتن زۆر جیاوازە لە بینی وشەو وێنەکێشان لەسەر شاشەی کۆمپۆتەر. لەم رێگەیەوەش منداڵان هانی خوێندەوەو بیرکردنەوەو نووسین دەدەین، کەوایە ئەمجۆرە سیمبۆلانە جیاوازن لە وێنە ئاشکراو ساناکانی سەر شاشەی تەلەڤیزیۆن.

مەبەست لەم باسە ئەوەیە کاتێک منداڵ بەدیار شاشەی تەلەڤیزیۆنە دادەنیشن و وەکو کەسێکی بێ گیان و بیرکردنەوە هەر تەنیا چاوەکانیان دەجولینن و هەستوبیرکردنەوەشیان سڕ دەبێت بەدیار شاشە گەورەو پڕ جولە ساناکان، منداڵی دوچاری ئیفلیجی مێشکی و دەروونی دەکەن. منداڵ هەمیشە دەبێت بیرو مێشکی بجولێنرێت، تا بەشێوەیەکی ئاسایی گەشە بکات.. گەشەکردنی زمان، بیرکردنەوە، لێکدانەوەو جولان تێکڕا کاریگەریان لەسەر گەشەکردنی مێشک هەیە. هەول بدە کاتی کورت بۆ سەیرکردنی شاشە تەرخان بکەیت، کاتەکانیش با پر بن لە سیمبۆلی پرسیار وروژێنەر، تاکو منداڵە وەکو گیانێکی بزێوو بژێو بیربکاتەوەو مێشکی بۆ دۆزینەوەی ئەو شتە شاراوانە بەکاربهێنێت، کە دەیان بینێت.

بێگومان نامانەوێت وا نیشان بدەین، ئیتر میدیا بەگشتی بەکەلکی

مندالان نابێت. نەخێر مەسەلە بەشێوەیەکی ترە. ئێمە باس لەچۆنیەتی و شێوازی بەکارهێنانی ئەم میدیایە دەکەین. چونکە بەشێک لەپرۆسەی پەروەردەی منداڵ پشت بە بەکارهێنانی ڤیدیۆو فیلم و سەیرکردنی تەلەڤیزیۆن دەبەستن و لەکردەوەشدا منداڵ بۆ دروستکردنی رۆشنبیری تایبەت بەخۆیان پێویستیان بەمجۆرە میدیایە دەبێت، کە دەبێتە هاوکار بۆ پێگەیشتنیان.

گەمەی زۆر و چالاکی هەمەجۆر، تەندروستی چاک و گەشەکردنی لەباری بەدوادێت. لەرێگەی گوێگرتن لە ئاخافتن دەکرێت بەشێکی چالاکییەکانی مێشک گورج و گۆلتر بکرێن، چونکە ئێمە دەزانین منداڵ پێش قسەکردن و خوێندنەوەو نووسین، فێری گوێگرتن لە ئاخاوتن لەزمان دێن..چالاکی و وێنە کێشان و یاریکردن بەئاوو بیناکردن و گەمەکردن لەگەڵ گەمە وبوکۆکەو گیانەوەر و دروستکردنی خواردن وهتد، هاوکاری منداڵ دەکەن خێراتر گەشە بکەن..

لەبیرمان نەچێت تەلەڤیزیۆن هەربەتەنیا منداڵ دوچاری نەخۆشی ناکات، بەلکە دوچاری کێشەی دەروونی و هەلچوون و گرژی و توندوتیژی و تاوان و سێکس و گۆشەگیری و دابران و سستی دەکات. کەوایە لەتەک شتە باشەکانی شاشە، منداڵ دەبێت بەوریایی بەرنامەو پرۆگرامی بۆ هەلبژێردریت و هەمووجۆرە بەرنامەو فیلمێک سەیر نەکات، واتە چاوەدێری و رێبەرایەتی دەوێت. بەتایبەتیش ئەو منداڵانەی بێ چاوەدێری خێزان ئازادنە پرۆگرامەکانی تەلەڤیزیۆن هەڵدەبژێرن.

کوڕی من کە تەمەنی ١٠ ساڵە دەیەویت هەموو کەنالەکانی تەلەڤیزیۆن سەیر بکات، بەتایبەتیش ئەو پرۆگرامە تایبەتیانەی ئێوران

دەردەچن.. هەمیشە دەڵێت گفتم پێبدە کە ئەم کەنالانەم بۆ دەکڕیت.. دەمەوێت سەیری ئەم پرۆگرامە تایبەتیانەی شەو بکەم. کاتێک لێی دەپرسم بۆ؟ دەڵێت هەموو برادەرەکانم سەیری ئەم پرۆگرامانە دەکەن، تەنیا من نیمە..!! یانی کاتێک مندال گەورە دەبێت ودەیەوێت وەکو دەوروپشتەکەی بیربکاتەوەو شتی تایبەتی خۆی هەبێت و لەهەمان کاتیشدا لە هاوڕێی و برادەرەکانی لە قوتابخانەو گەرەک دانەبڕێت، دەیەوێت سەیری تەلەڤیریۆن بکات و ئەو شتانە بزانێت وببینێت کە گوێی لێدەبێت. نایەوێت ببێتە سەرچاوەی قسەو قسەلۆکی برادەرەکانی.. کە دوور نییە، ئەمجۆرە پرۆگرامانە هانی منداڵ بۆ شتی نادروست و نەگونجاو بدەن.

تا منداڵ گەرەتر دەبێت، ئارەزووی بەکارهێنانی شاشەی لا بەهیزتر دەبێت، لەهەمان کاتیشدا پێویستی منداڵ لەگەل بالاکردنی بۆ وەرزش و یاریکردن پتر دەبێت. کاتێک منداڵ بەرەو قۆناغی ناوەندی دەچێت لەجیاتی زۆر سەیرکردنی تەلەڤیزیۆن هەولبدە چەند خاڵیکی تێدا دروست ببێت، کە دەبنە هاوکار بۆی لە چۆنیەتی بەکارهێنانی میدیاو دروستکردنی تواناکانی لەپێناو بیناکردنی رۆشنبیری گونجاو، ئەم هەنگاوانەش وەکو (گلۆرلا دێگاتانۆ و کاسلین باندار) (١٨) ئاماژەیان پێکردووە بریتن لە:

– فێر بێت چۆن فێر دەبێت. وەکو(وریا بوون و بەدواداچوون، یاریکردن)

– رەوشتی چالاکی تەندروستانە. وەکو(سەما، یاریی تەندروستانەی منداڵان، وەرزش، جولانەوە تد..)

– توانای رۆشنبیری. وەکو (فێر بوونی خوێندنەوەو نووسین،

یاری بە وشە و پیت وژمارە)

- فێربوون دەربارەی خودی خۆی. وەکو(کاتی هێمن، دۆزینەوەی جالاکی هەمەجۆر، دۆزینەوەی کێشەو چارەسەرکردنی، یارمەتی خەڵکی تر، حەزم لەچییە، چۆن من لەخەڵکی تر جودام، حەزم لەچییە، لەچ بەهێزم تد..

کاتێک خێزان بڕیار لە چۆنیەتی و شێوازی بەکارهێنانی میدیا دەدات، ئەو کاتە تێدەگەین کە تەلەڤیزیۆن و ڤیدیۆ چۆن هاوکاری منداڵان دەکەن بۆ گەشەکردن و وەکو سەرچاوەیەکی گرینگ بۆ فێربوون بەکاردهێنرێت، بەتایبەتیش کە ئێمە باس لە تەندروست بوونی منداڵ لەکاتی بەکارهێنانی میدیا دەکەێن، تێدەگەین ئەم بوارە چەندە بەخێرایی و راستەوخۆ دەتوانێت کاریگەری لەسەر مێشک و باری دەروونی و هەتا فسیۆلۆژیای منداڵ دروست بکات.

زۆر لە سەرچاوەکان ئاماژە بەرز بوونەوەی تاوان لە دەرەنجامی بەکارهێنانی فیلمی توندوتیژی و دزی وراوروت دەکەن، تەنیا ئەم خوە لای مداڵانیش بە پێچەوانە لە ئاستێکی ترسناک دایە، سەرباری ئەو پرۆگرام و فیلمانەی منداڵ دوچاری خەمۆکی و ترس و گۆشەگیری و دڵەراوکێ و نیگەرانی و دابڕان و خۆشاردنەوە دێن.

دیارە ئەمانە لەروی کۆمەلایەتی کاردانەوەی سلبی لەسەر کەسێتی منداڵان دروست دەکەن، ئەم کاردانەوە سلبیانەش هیچێکیان لەکاردانەوە لەسەر تەندروستی لەش و مێشکی منداڵان کەمتر نییە. بەلکە وەکو هۆکارێکی ترسناک تا ماوەیەکی درێژ منداڵ روبەروی کێشەو گرفت دەکەن. منداڵ فێری رۆشنبیرێکی نوێ و سەردەمانە دێت و خێراترو چاکتر لە پێشوو تێکەلی میدیا دەبێت، لەهەمان

کاتیشدا، روبەروی ئازارێکی کۆمەڵایەتی دەبێتەوە، کە دوور نییە، هەندێکجار ببێتە هۆی دەرچوون لە شیرازەو سنوری سروشتی و تاوان و کاری نایاسایی و خراپیش ئەنجام بدەن

وەکو گوتمان دەکێت بۆ چارەسەری ئەو کارە نادروستانەی لەرێگەی میدیاوە منداڵ دوچاری کێشە دێن، خێزان بەرنامە بۆ کۆنترۆل و بەکارهێنانی میدیا بکەن و کاتەکانی بەکارهێنانی میدیا دابەش بکرێت و وریایی ئەوە بین، منداڵەکان ناچارمان نەکەن کۆنترۆل و توانای بەدواداچوون و لیکۆلینەوەمان لەدەست بدەین.

(٥)

## تراژیدیا و هەوال لە تەلەڤیزیۆندا

زۆربەی وڵاتانی دونیا روبەروی کارەساتی سروشتی و شەرو گرانی و مردن و کوشتاری ناوەخۆیی و جینۆساید هاتوون، تەنیا لەهەندێک شوێندا ناکۆکی و کێشە تراژیدییەکان بەردەوامن و رۆژانەش لەرێگەی میدیای بیستراو بینراو خوێندراو و ئەنتەرنێت راستەوخۆ هەوالی روداوو کارەساتە دڵتەزێنەکان دەبینین. تەنیا رۆژانە لەرێگەی سەرنجکراکێشانی رای گشتی وێنەی ئەو منداڵانە دەبینین، کە دەنێو روداوەکاندا هاوریان لیهەلدەستێت یاخود بوونەتە قوربانی کارەسات و روداوەکانی توندوتیژی. ئەمانە تێکڕا رۆژانە لەهەموو ماڵێک ولەبەرچاوی هەموو منداڵیکی دونیادا بڵاودەکرێنەوە.

لەئەمەریکاو زۆربەی وڵاتانی دونیا تەلەڤیزیۆن رۆلێکی گرینگ لە بچوکردنەوەی دونیا بۆ گوندێکی بچوک دەگێڕیت. خەڵکی ئەمەریکا بەرێژەی ٦٠%یان تەلەڤیزیۆن وەکو سەرچاوەی دەستخستنی هەوال

بەکاردەهێنن و تەنیا ٢٣%یان رۆژنامە دەخوینێتەوە. (١٩)

منداڵاکانمان چ هەست ونەستێکیان دەبێت، کاتێک دەبینن منداڵی هاوتەمەنی خۆیان دەکرێنە قوربانی، یا برسی وبی سەرپەرشت لەشوێنە گشتیەکان دەژین، یا وەکو پاشماوەی جەنگ و قڕکردن وەکو کەلوپەلی نێو ململانێکان بەکاردەهێنرێن. کاتێک منداڵ توانای لێکدانەوەی بۆ هەموو ئەو وێنە تراژیدیانە نییە، دەبێت چۆن بیر لە چارەنووسی خۆی بکاتەوە، کە رۆژانە ئەم وێنەو هەواڵە دڵتەزێنانەی روبەرو دەبێتەوە.

منداڵانی کوردستان دەنێو جەرگەی کارەساتەکاندا گەورەبوون، ژمارەیەکی زۆریش بوونەتە قوربانی شەری پتر لەیەک سەدەی داگیرکەران و جینۆسایدو کیمیاباران و ئەنفال.. نەک تەنیا لەرێگەی تەلەڤیزیۆن و دەزگاکانی میدیاوە، کارەساتەکان دەبینێت، بەلکە خۆی قوربانی ئەو  پێکهێنەرەو بەشێکی سەرەکی کارەساتەکانیشە.

هەستکردن تاکە ئامرازێکە منداڵان دەتوانن هاوسەنگی دەروونی خۆیانی پێراگرن، بۆیە کاتێک هەست بە نیگەرانی و دڵەراوکێ و ترس لەکاتی سەیرکردنی هەواڵ دەکەن، دوچاری تێکچوونی هاوسەنگی دەبن. باشە منداڵیک لەکاتی سەیرکردنی هەوالی سیاسی چ زەوق و تامێک وەردەگرێت؟ منداڵێک لەکاتی سەیرکردنی هەواڵەکانی رودانی کارەساتی سروشتی و تەقینەوەی بۆمب و شەڕو ترومبیل تەقاندنەوەو سەربڕین و کوشتنی بەکۆمەل چۆن هەستکردنێکی خەمناک و دڵتەنگانەی هەبێت؟. کاتێک هەست بەئارامی دەکات، کە تەنیا لەو دوورە. بەڵام دوور نییە هەمان منداڵ بیر لە رودانی هەمان کارەسات لەنزیک خۆشی بکاتەوە، بۆیە ترس دایدەگرێت و لەهەمان

کاتیشدا خەمناک دەبێت، کەناتوانێت پێشگیری لەم روداوانە بکات و هاوکاری ئازار پێگەیشتووان بکات.

منداڵ هەڵبژێری پرۆگرامەکانی هەواڵ نییە، کەسانێکی گەورە بەسەریدا زاڵ دەکەن.. بۆیە لەکاتی سەیرکردنی هەواڵی وێنە دار منداڵ دوچاری هەلچوون دێت، ئەو هەڵچوونەی کە لەناوەوە بۆ بێدەنگکردنی و دەمکوتکردنی دێت و هەروەها هەڵچوون لەسەیرکردنی ئەو وێنە ترسناکانەی بەشی زۆریان خوێنیان لێدەچۆڕێتەوە، یا کارەسات و روداوی پۆلیس و کوشتن و دزی و راوروتن. ئەم هەڵچوونەش دەبێتە مایەی تێکچوونی هاوسەنگی دەروونی، کەلەئەنجامی هەڵچوون و شێوانی هەستونەست و بیرکردنەوەی منداڵ دێت.

منداڵ هەست بە بێزاری لەهەواڵی سیاسی دەکات، چونکە بێدەنگی و ئارامبوونی بەسەردا دەسەپێنرێت، لەکاتێکدا منداڵ هیچ پەیوەندی بە ململانێی سیاسی و چارەنووسی سیاسی دەنگوباسی هەلبژاردن و کۆبوونەوەو بڕیارەکان و کێشەکانەوە نییە، لەهەمان کاتیشدا منداڵ ئارەزووی جولەو قسەکردن و دوانی هەیە، نەک بێدەنگ بوون. ئەمەش دەبێتە هۆی تێکچوونی هاوسەنگی هەستکردن لای منداڵ، واتە لاسەنگی دروست بوون لەباری دەروونی.

بۆیە کاتێک منداڵ لەکاتی هاتنی هەواڵ بێزار دەبێت، ئاساییە چونکە دەزانێت کەسانێک لەشاشەی گەورە گەورەتر دەردەکەون وبە زمانێکی باڵاتر لە تێگەیشتنی خودی منداڵ قسە دەکەن و سەرۆک و بەرپرسەکان وەکو کەسانێکی هێزدارو زۆرجاران مەترسیداریش دەردەکەون، کە هیچ لەزەتێک بە منداڵ نادەن. لەم حالەتەدا دەکەونە

بە تورەیی و یاسای دایک وباوکیشەوە، کە پێیان دەڵێن  دوور کەونەوەو بێدەنگ بن، بڕۆ نانت بخۆ، یا یاری بکە، یا ئەرکی ماڵەوەت تەواو بکە..ئەمە بۆ تۆ نییە. لە راستیدا تەلەڤیزیۆن کارێکی رۆشنبیری سود بەخشە ئەگەر بتوانرێت بۆ پەرەپێدانی رۆشنبیری منداڵان بەکار بهێنرێت. بتوانرێت پرۆگرامێکی تێدا پەخش بکرێت پارسەنگی پێکهاتەی دەروونی منداڵ رابگرێت و منداڵ لە فشارو کاردانەوەو هەڵچوون و ترس بپارێزێت.

کاتێک پێشکەشکەری بەناوبانگی پرۆگرامی منداڵان (فرێد رۆگرێس) باسی کارەساتی ١١ی سپتێمبەرو کاریگەری لەسەر بیرکردنەوەی منداڵان دەکات، وەها باسی روداوەکەو هەلوێستی زارۆکانمان بۆ دەخاتە روو. لە ١١ی سپتێمبەردا بەیانیان سەیری تەلەڤیزیۆنم دەکرد، منداڵە تەمەن ٤ ساڵەکەم، لەنزیک من یاری دەکرد، بەڵام من بیرم لێنەکردبۆوە کەئەو دەزانێت چی قەماوە. من گوتم ئەمە فرۆکەبوو خۆی بە بینایەکە دادا. لەو کاتەوە تا ئێستا، کەسەیری تەلەڤیزیۆن دەکات دەڵێت فرۆکەیەکی زۆر خۆیان بە بینایەکە دادایەوە. ئەو نازانێت ئەمە ڤیدیۆیە بەردەوام دوبارە نیشان دەدرێتەوە. دوای ئەوە هەستم کرد، واچاکە من تەلەڤیزیۆن بکوژێنمەوە، کاتێک دەمەوێت بزانم چی رویداوە، چاکترە بۆ چەند خولەکێک گوێ لەرادیۆ بگرم. هەروەها هەستم کرد کە چاکترە تەلەڤیزیۆن پێنەکەم.(٢٠)

لێکۆلینەوەکان دەراینخستوە کە توندتیژی کاریگەری لەسەر منداڵان هەیە، هەرچەندە منداڵ ئارەزووی سەیرکدنی ئەو پرۆگرامانەی زۆرە کە توندوتیژی وخوێنی تێدایە. کاتێک سەیر

دەکەین فیلمی ترس و خەیاڵی زانستی زۆر پێشکەشی منداڵان دەکەن و دوور نییە پێشوازی زۆری منداڵان لەمجۆرە فیلمانە لای منداڵان بۆ نەبوونی هوشیاری لەژیانی تایبەتی وئەزمونی کەسێتی دەگەڕێتەوە کەهەموو شتێک تێیاندا رەنگە روبدات، بەڵام هیچ پەیوەستەکیشی بە واقیعەوە نییە. لێکۆڵینەوەکان دەڵێن رەنگە بەکارهێنانی چەقۆو شیرو کەرەستەی تیژ کەلەژیانی رۆژانە بەکاردێت، کاریگەری زۆر زۆرتر بێت لەو ئاگرەی کە راستەوخۆ کاری پێناکرێت.

کاتی پیشاندانی تەلەڤیزیۆن کاریگەری زۆری لەسەر سازدانی ترس هەیە، رۆلێکی گرینگیش لە هەلچوونی بینەرانی بچووک دەگێڕیت بۆ نیشاندانی توندوتیژی. ئەگەر کاتی سەیرکردن درێژ بێت کاریگەری لەدروستکردنی ترس پتر دەبێت، هەتا ئەگەر روداوی توندوتیژیشی تێدا نەبێت.هەروەها کاریگەری بەهای ئەخلاقی و مەعنەویش لەنێو فیلمەکانی توندتیژیدا هەیە. لەهەمان کاتیشدا لەرێگەی نیشاندانی راپۆرت دەربارەی مردن لەبرسان لە بیابان و شەری کەنداو، گیانی رقلێبوونەوەو تورەیی لای منداڵان دروست دەکات.(٢١)

هەروەها ژمارەیەک لێکۆلەرەوەی تر پێیان وایە ئەم باسە کلاسیکەو منداڵ ئەم ترسەی لەسەر نییە، بەم شێوەی کەباسی دەکەین و مەرج نییە تەلەڤیزیۆن هەمان ئەم کاریگەرییە ترسناکەی هەبێت کە ئێمە باسی دەکەین، بەلکو ئەم یارییە توندتیژیانەی منداڵ لە باخچەکانی قوتابجانە ئەنجامی دەدەن، پەیوەندی بە روداوە توندتیژەکانی نێو تەلەڤیزیۆنەوە هەیە. دەبێت بڕوامان بەوە هەبێت کە یاریکردن چاکترین رێگەیە بۆ ئەوەی منداڵان بتوانن ناوەوەی خۆیانی

پێ دەربڕن.(٢٢)

ئێمە کارێکی ترسناک دەربارەی مندالان دەکەین کە دەمانەوێت جیهانی دەرەوەو دەورپشتیان لە ڕێگەی پرۆگرامەکانی توندتیژی نیشان بدەین. چونکە هەموو ئەو هۆکارانەی باسیان دەکەین، لەسەر خورەوشت و هەلسوکەوتی منداڵان ڕەنگ دەداتەوەو ئەمەش وادەکات دونیایەکی پڕ لەترس و نیگەرانی و دوژمنکارانەو تورەیی و ڕقلێبوونەوە بۆ منداڵان دروست بکرێت. کە پێچەوانەی ئەو پرۆگرامە پەروەردەییە دەبن، کە هاوکاری منداڵ بۆ پەرەپێدانی ڕۆشنبیری گشتی دەکات.

دیارە ئێمە دەزانین کە منداڵان ناسکن و زۆر بەهەستیاریشەوە چاو لە شت دەکەن، وا تێنەگەین منداڵ بایەخ بە سەیرکردن و گوێگرتن لە روداوەکان نادات، بەپێچەوانە بەبایەخەوە دەیانەوێت لەڕێگەی هەست ونەستی دایک وباوک و دەورپشتەوە تێبگەن و بزانن چی رودەدات، یا رویداوە. کاتێک منداڵ دەبینێت خێزانەکەی لەکاتی سەیرکردنی تەلەڤیزۆن وگوێگرتن لەهەوال دڵتەنگ وپەست دەبن و هەڵدەچن وگرژ دەبن، ڕاستەوخۆش منداڵەکە هەست بەنیگەرانی دەکات. ڕاستە منداڵان دەربارەی تاوان وجۆری کێشەکان هیچ زانیارییەکان نییەو پێویستیشیان بەوە نییە بیزانن، بەلام وێنە زیندووە ڕاستەوخۆکانی کارەساتە سروشتی و ناسروشتییەکان کار لە هەست ونەستی مندال دەکات.

منداڵی من ئیستاش لەناو هێنانی سەدام حوسێن نیگەران دەبن وتوشی دڵەڕاوکی دێن، چونکە لە ڕێگەی بینی هەواڵەکانی تەلەڤیزۆن

و شەر لە عێراق و پرسیارو وەلام لەماڵەوەو قوتابخانە، دەزانن رژێمی سەدام حوسێن ترسناک بوو، خەڵکی دەکوشت و منداڵی ئازار دەداو باوک دایکی منداڵانی زیندانی دەکردو ئەنفال و جینۆساید کردووە. کاتێک بەردەوام وێنەی تەقینەوەی ترۆمبێل و کارەساتەکانی کاری تیرۆریستی دەبینن، دەموجاویان گرژ و پرسیارەکانیان دوبارە دەکەنەوە.. سەدام ترسناکە؟.. ماوە و ئێستاش خەلک دەکوژێت ودەبڕێت و ئازاری منداڵانی کوردستان دەدات؟.

کاتێک ئەم هەست ونەستەیان دەبینم دەبێت بابەتەکەیان دەگەڵ بگۆڕم.. کەنالی هەوال بگۆڕم و خۆ بەهەندێک شتی تر خەریک بکەین، کە دوورە لەکەشوهەوای تراژیدیاو روداوی ترسناک و هەواڵی ناخۆش. وەکو فرێد رۆگرێس دەڵێت منداڵ هەمیشە دەیانەوێت بزانن ژیانیان ئارام و پارێزراوە لەلایەن خێزانەکانیانەوە وبۆیەشە بەردەوام دەیانەوێت جەخت لەسەر ئەم لایەنە بکەنەوە.

بۆیەشە لیکۆلینەوەکان کاردەکەن بۆ ئەوەی منداڵ لە هەواڵ و سەیرکردنی فیلمی توندوتیژی و خوێناوی و کارەساتەکان دوور بخرێنەوە.چونکە ئەمجۆرە پرۆگرامانە نەک هەر کارێکی سلبیان لەسەر باری دەروونی منداڵ و هەڵچوون و خەمۆکی ونیگەرانی ودڵەراوکێ کردووە، بەلکە بوونەتە هۆکاری بلاوبوونەوەی توندوتیژی و رودانی کارەساتی نابەجێی وشەڕ لەنێو مداڵاندا. تەنیا هۆکارێکیش دەبێت منداڵ روبەروی کاردانەوەی سلبی و رقلێبوونەوەو خۆشنەویستنی خەڵکی تریش ببێتەوە. بەتایبەتیش وێنە زیندووەکانی تەلەڤیزیۆن و هەواله کارەساتاوییەکان ماوەیەکی دوورتر کاریگەریەکانی دەردەکەوێت.

چۆن بتوانین هاوکاری منداڵەکان بکەین لەکاتی بین و گوێ لێبوونی کارەساتی تراژیدی و وێنە خوێناوییەکان. چاکترین ڕێگە ئەوەیە منداڵ دوور بێت لە هەواڵی ترسناک و روداوە خوێناوییەکان، با تەلەڤیزیۆن لەکاتی جودا بەکاربهێنرێت، هەروەها روداوەکانی بۆ ش بکرێتەوە کەئەمەیان زۆر قورسە، چونکە زۆرجاران خێزانیش ناتوانن شی کردنەوەی دروست چنگ بخەن و بەتەواوی لەروداوەکە نەگەیشتوون.. ئایا بڵێین ئەمانەی ئەم کارانە دەکەن (دوژمنی مرۆڤایەتین، ترسنۆکن، شێت و هارن، تیرۆریستن، بێ ویژدانن، منداڵ دەتسێنن.. تد) ئەمانە هەمووی بۆ منداڵان قورسن و ناتوانرێت هەزم بکرێت.. نەخێر دوور نییە ئەمجۆرە وشانە کێشەکە لای منداڵ ترسناکتر بکات و ترسی پتر لایان دروست بکات. بۆیە واچاکە خۆ لەسەیرکردنی ئەمجۆرە هەوال وروداوە  تراژیدایانە بپارێزین، کە دوچاری ترس و نیگەرانی و کاردانەوەی سلبیمان دەکات.

لەمبارەوە (فرێد رۆگرێد) بەمجۆرە هەولی راستکردنەوەی کەشوهەوایەکە دەدات: دەربارەی روداوەکانی شەڕ، تیرۆر، ئاگرکەوتنەوە، باوبۆران و رەشەبا، فریاکەوتن.. کە منداڵ پرسیاری کرد، هەلدە یەکەمجار تۆ لێی بپرسیت کە ئەو چ هەست پێدەکات؟ ئەگەر گوتی نازانم.. تۆ هەلبدە پێی بڵێیت (من دڵتەنگم دەربارەی دەنگوباسەکان و نیگەرانیشم، بەڵام من تۆم خۆش دەوێت و من لێرەم تا ژیانی تۆ بپارێزم).(٢٣)

## ڕێگاکانی خۆپارێزی لە تەلەڤیزیۆن

- کوژاندنەوەی تەلەڤیزیۆن لەکاتی هەواڵە تراژیدیەکان.
- کار بکە منداڵە هەست بە ئارامی و ئاسایشی زۆرتر بکات.
- کاربکە لەرێگەی باوەشپێکردن و بەکارهێنانی وشەی خۆشم دەوێت و لێت جیانابمەوە، هێورو دڵنیای بکەیتەوە.
- هەوبدە هاوبەشی بکەیت لەهەندێک کاری تری وەکو (گوێگرتن لە مۆسیقاو رۆیشتن بە پا لەدەرەوەو وێنە کێشان و وەرزش).
- جیاوازی کردن لەنێوان کارەساتی سروشتی و کاری توندوتیژی.
- کۆکردنەوەی زانیاری پێویست لەرێگەی کتێب خوێندنەوە.
- بەردەوام کار بکە منداڵ لەمبارەوە لەنیگەرانی و دڵتەنگی و تورەبوون و ترس دوور بکەوێتەوە.
- خێزان بایەخ بەهەست ونەستی منداڵ بدات.
- رۆشنبیری سایکۆلۆژی و پەروەردەیی منداڵان بایەخی پێبدرێت لە نێو (خێزان و قوتابخانە).

چی بکرێت بۆ ئەوەی هەندێک لەم کێشانە کەمبکرێنەوە کەمنداڵ لەدەرەنجامی سەیرکردنی فیلمەکانی توندوتیژی دچاری دێن. واتە ئەرکی یەکەم دەکەوێتە سەر سانی خیزان بۆ ئەوەی بەشداری لە راستکردنەوەی هەلومەرجە نادروستەکان بکەن، کە رەوشی تەندروستی و نەریت و هەلسوکەوتی منداڵانیان گۆڕیوە. لەم بوارە چەند هەنگاوێک پێوسیتە.

## چی بکرێت، چی سەیر بکرێت؟

- خێزان بەرنامەکانی تەلەڤیزیۆن هەلبژێرن .
- ئەو پرۆگرامانە سەیر بکەن، کە منداڵ لە بیرەوەرییەکانی دەربارەی توندتیژی دوور دەخاتەوە.
- منداڵ بەتەنیا لەبەردەم شاشەی تەلەڤیزیۆن وبەکارهێنانی سەرچاوەکانی تری میدیا بەجێنەهێڵدرێت، کەدەبنە مایەی توندوتیژی.
- چاوەدێری هەلسوکەوت و خورەوشتی بکرێت.
- کاتێک منداڵ پەنا دەباتە بەر خێزان بۆ دەرخستنی ترسەکانی کە لەرێگەی تەلەڤیزیۆنە پێی گەیشتووە، هاوکاری بکرێت وبەشێوەیەکی ئاسایی مامەلەی دەگەل بکرێت.
- لایەنی پەروەردەیی کاریگەری چاکی لەسەر کەمکردنەوەی ئەمجۆرە ترسناکییە دەبێت کەتەلەڤیزیۆن بەشێوەیەکی سلبی دروستی دەکات.
- وا چاکە منداڵ لەسەر خوێندنەوە رابهێنرێت.
- لەکاتی سەیرکردنی تەلەڤیزیۆن پرسیار لەمنداڵ بکرێت.
- بایەخ بەرۆشنبیری منداڵ دەربارەی پرۆگرامەکان بدرێت.

(٦)

## منداڵ لەوێنە و وێنە لە رووداودا

یەکێک لەکارە گرینگەکانی میدیای منداڵان دروستکردن و گەیاندنی وێنەیە.. بەڵام چ وێنەیەک.. بەرنامەکانی منداڵان بایەخ بەم لێکۆلینەوە زانستیانە دەدەن کەدەربارەی گەشەکردن و پێگەیشنی منداڵان ئەنجام دراون. واتە کاتێک باسی یاریکردن و وەرزش و گۆرانی وسەماو خویندنەوەو باری تەندروستی و گیانەوەرو دارودرەخت و شتی تر دەکرێت.. وێنەی زیندوو تێکەڵ بە خەیاڵ و هەڵسوکەوتی منداڵان دەکرێت.. لەرێگەی زانیاری گەورەکان و بە بیرکردنەوەو شیوازی قسەکردن ودەربڕینی منداڵانیش وێنە خوداکان پێشکەش دەکرێن.

منداڵ حەز دەکات مامەلە دەگەڵ سروشت بکات، یا دەیەوێت سروستی ئەو کەسایەتی و گیانەوەرو ئەکتەرو شتانە بدۆزێتەوە کەلەرێگەی چیرۆک و بەسەرهاتەکان مامەلەیان دەگەڵ دەکات. لاتێک

باسی بۆشایی ئاسمانی بۆ دەکرێت، بەدەیان شوێنی یاریکردن لە شوێنە تایبەتی وگشتیەکاندا هەیە ئەو هۆکارو کەرەستانەیان بەشێوەی سادە تێدا دروست کراوە، کە وێنەی دروستی ئەو شتانە فێری مندالان دەکات کەباسی بۆشایی ئاسمان دەکات.

کاتێک منداڵ فێری وشەیەکی تازە دەکرێت وێنەی زیندووی ئەو زاراوەی بۆ دروست کراوە، کە دەتوانێت هاوکاری گەشەکردنی منداڵ لەروی پەروەردەییەوە بکات. بۆیە کاتێک تەلەڤیرۆنی مندالان و پرۆگرامەکانی پەروەردەو فێرکردنی مندالآن دەبینین، بەدەیان بەلگەی وێنەدار بۆ یارمەتی دانی مندالآن دەدۆزینەوە کە هاوکاری دەکەن، بۆ سانا فێربوون و تێگەیشتن وتەرو بەزەوق کردنی بابەتەکەش لەهەمان کاتدا.

تەلەڤیزیۆن رۆژهەلآتی و کوردسیش کەلەژێر ئەم کاریگەرییە سلبیە بەرێوە دەچێت، دەمانەوێت وێنەی دەسکەوتە سیاسییە گەورەکانمان خۆمانیان نیشیان بدەین.. واتە وێنەی ئەو شتانەیان پێشان دەدەین و لا جوان دەکەین کە حیزب یا دەسەلاتێکی سیاسی یانژی سەرکردەیەک کردویەتی..لەهەمان کاتیشدا وێنەی خودی مندالآکان بۆ پروپاگەندەی سیاسی وحیزبی بەکاردەهێنرێن.. تەنیا هەتا کاریگەری ئایدیۆلۆژی و سایکۆلۆژیش بەسەر وێنە دروستکراوەکانی بەرنامەکانی مندالآنەوە دیارە.

بەرنامەی ئەو تەلەڤیزیۆنە سەرکەوتوانەی تایبەتن بەخێزان و پەورەردە لەوەیە مندالآن هەست بەوێنەی زیندووی بیرکردنەوەو هەستی نەستی خۆیان دەکەن و هەروەها سروشتی ئەو شتانە دەبینن کە رۆژانە لەژیانی ئاسایی هەستی پێدەکەن.. وێنەی بەرنامەکانیان

پریەتی لە(جولەکردن وسەماکردن و گۆرانی وهەلپەرکێ، هاوکاری وهاوبەشی یەکتر، مامەلەکردن لەگەڵ گیانەوەران لەدارستان و مالەوەو سروشت و  قوتابخانە و دائیرەی پۆلیس وئاگر کوژێنەوەو پۆست و پێشمەرگە. هەروەها وێنەکان پڕیانە لە رەنگ و دەنگ جولەی سەربەست... بەرنامەکان تابەتن بە تەمەنی جودای منداڵ..).

بۆیە زۆر گرینگە لەکاتی بیرکردنەوە لە وێنەکێشانی واقیعی ئەو روداو بەسەرهاتانەی، یا ئەو میتۆدو رێگایانەی هاوکاری مندالان دەکەن بۆ فێربوون،پڕاوپڕ بێت لە وێنەی خودی مندالان.. ئەو وێنانەی بەشێوەیەکی سروشتی مندالاڵ هەلسوکەوتی تێدا دەکەن، شتێکیان بەسەردا نەچەسپێنراوە. واتە خۆیان وێنەی خۆیان پێشکەس دەکەن، هەروەها روداوەکانیشیان وەکو خۆی وێنە بۆ کێشاوە. شتێکی دوور لە روداوەکانیان بۆ درێژکردنەوەو رازاندنەوەی خواستە تایبەتیەکان پێوەنەلکێنراوە..

گرینگ ئەوەیە لەتەلەڤیزیۆندا هەلبدرێت منداڵ وخێزان  دوور لە تێوەگلانی ئایدیۆلۆژی و سیاسی لەنێو بەرنامەکانی منداڵان دەرکەون، تا هەست بە خودی منداڵانەی خۆیان بکەن. کارێکی زۆر گرینگە بایەخ بە تێکەلکردنی گیانەوەران و سروست وەکو ئامرازێکی پەروەردە لە بەرنامەکانی میدیا کەتایبەتن بەمندالان بدرێت. وا چاکە منداڵ خۆیان دەگەڵ وێنەی زیندووی ئەم گیانەوەرو پەلەوەرو شوێنانە دەرکەون کە بۆ پەروەردەکردن بەکارهێنراون.

کارێکی ئێجگار پێویستە بەرنامەو پرۆژەکانی منداڵان پشت بە سەرچاوە سروشتییەکان بۆ پەرەپیدان و بەسەلیقەکردنی  منداڵان و گەشەپیدانیان بەکاربهێنرێت. چونکە ئێمە هەرچی لەخەیاڵ و

ئەندەشیدەدا بەکاربهێنین، ناگاتە ئەو وێنە زیندوو و سروشتیانەی منداڵ حەز دەکەن، هەمیشە بیان بینن و خۆیان شتی خەیاڵیان دەگەڵدا دروست بکەن. واتە وێنەکان واچاکە زیندوو بن و منداڵان خۆیان تێیدا بەسدار بن و روداوەکانیش، ئەوانەی دەبنە پێکهێنەری چیروک و بەسەرهاتەکان واچاکە وێنەی زیندووی ژیانی منداڵ ودەوروپشتی خۆیان بێت.(٢٤)

(٧)

# تەلەڤیزیۆنی پەروەردەیی

خێزان چۆن دەتوانێتماڵەکەی خۆی، ژوورێکی چکۆلەو ساردو سڕ، یا گەرمی دوور لە فێنکەرەوە بکاتە مەلبەندێکی چالاک و پڕ لەجولەو بزاڤ بۆ منداڵاکانی. دەزانم هەندێک شت تەنیا بەخەیاڵ و شتی نا دروست و نەکارا دەچن، بەڵام ژیانی پێویستی بەگۆڕان و منداڵەکانیش پێویستیان بەسەرپەرشتی و چاوەدێری زۆرتر هەیە، تا سود لە تەلەڤیزیۆن و بەرنامەکانی لەروی پەروەردەو فێرکردنەوە وەربگرن. رەنگە بەشێکی زۆری خێزانی کورد بەهۆی نزمی ئاستی رۆشنبیری و کێشە کۆمەلایەتی وئابوری وتارادەیەکیش پاشماوەکانی سیاسەتی جینۆسایدو قڕکردکردنی داگیەران دژی خەڵکی کوردستان، ئامادە نەبێت بۆ پێشوازی کردن لەمجۆرە پرۆگرام وبۆچوونانە.. بەڵام لەبیرمان نەچێت ئەمرۆ منداڵی کورد بەهۆی کرانەوەی دەرگای جیاوازی وهەمەبۆچوونی و پێکهاتەی سیاسی جودا، روبەروی

راگەیاندنی ئایدیۆلۆژی جوداو هەمەچەشنیشە.

لەروی پەروەردەیشەوە کەسانی هەلسورێنەری بەرنامەو پرۆگرامە پەروەردەییەکانی منداڵان نەگەیشتوونەتە بڕوای ئەوەی کە دەبێت شێوازی نویَ وسەردەمانە بۆ پەروەردەکردنی منداڵان بەکاربهێنرێت، یا دەزگاکان رکابەری گۆرانکارین و بوارەکانی پەروەردە مژولی کاروپرۆگرامی ترە. سەرباری هەژاری رۆشنبیری لەم بوارەدا.

شارەزایانی ئەم بوارە لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێیان وایە بۆ دروستکردنی منداڵان تا توانای هەلبژاردن و سەیرکردنی رەخنەگرانەیان هەبێت پێویستە چەند هەنگاوێک بنرێت.. ئەویش پێگەیاندن و فێرکردنی خێزانەکان بۆ ئەوەی لەسەر ئەوە رابهێنرێن چۆن منداڵەکانیان سەیری تەلەڤیزیۆن دەکەن.

دەزانین ژمارەیەکی زۆر خێزانەکانمان هیچ بیرۆکەیان دەربارەی پێکهاتنی بەرنامەو پرۆگرامەکانی تەلەڤیزیۆن نییەو لەهەمان کاتیشدا زانیاریان دەربارەی کارتیکردن و کاردانەوە خێراکانی ئەم پرۆگرامە رۆشنبیری و پەروەردەیانیە نییە، کە کار لەسەر کەسێتی منداڵان دەکەن. بۆ ئەم مەیەستە (لەورین ئاکسەلۆرد) دەلێت بۆئەوەی رێبەرایەتی منداڵەکەت بکەیت تاکو بینەرێکی وریاو هەلبژێرو رەخنەگر بێت، تۆ تەنیا سێ رێگەت لەپێشە بۆ ئەم مەبەستە ئەویش (سەیرکردن، گوێگرتن و قسەکردنە)(٢٥).

## سەیرکردن:

بۆ دەبێت دەگەڵ منداڵەکەت سەیری بەرنامەکانی تەلەڤیزیۆن بکەیت. تا لەکاتی چاودێری کردنیان  بزانیت منداڵەکەت چتۆ بەرنامەو پرۆگرامەکی حەز لێیەو چۆن سەیری پرۆگرامەکان دەکات و چەندە لەبەردەم تەلەڤیزیۆن دەمێنێتەوەو هەلسوکەوتی چ گۆرانێکی بەسەردا دێت و ئەو شتانە چین خێراو کارا تێکەڵ بە بیرکردنەوەو لێکدانەوەکانی منداڵان دەبن.. لەکوێ پێویستە بوەستێت .

دەزانم ئێمە هەمووومان بەهۆی کۆمەلێک هۆکار توانای سەیرکردنی تەلەڤیزیۆنمان بەشێوەیەکی رۆژانەو بەردەوام نییە، وەلێ دەکرێت هەندێک کات بۆ ئەم مەسەلەیە دیاری بکەین. لەبەر دوو هۆ؛

یەکەمیان: منداڵ زۆر ئارەزوو دەکەن دایک و باوک بەشداری سەیرکردنی پرۆگرامەکان و فیلمیان دەگەڵ بکەن.

دووەم: تۆش دەتوانیت لەرێگەی کاتێکی کورتی دیاری کراو، بزانیت چی لەم شاشە گەورەیەوە دێتە نێو ماڵ و دڵ و دەروون و بیرکردنەوەی منداڵەکانت.

باشە پلانێک دابنێ بەلای کەمەوە هەفتەی جارێک دەگەڵ منداڵەکەت سەیری تەلەڤیزیۆن بکەو بەشداریت دەبێتە هۆکارێکی

گرینگ لای منداڵەکە، تا بەسەلیقەو وریایەوە سەیری تەلەڤیزیۆن بکە. دەزانیت منداڵی تەمەن گچکە زۆر ئارەزوو دەکات، لەکاتی سەیرکردنی پرۆگرامەکان ئەو شتانەت بۆ ئاماژە پێبکات، کە حەزیان لێدەکات و یاخود کاری لێدەکەن. ئەمە ساناکاریت بۆ دەکات تۆ چاکترو گونجاوتر لە هەلسوکەوت و بیکردنەوەی منداڵەکەت بگەیت و خاڵە گرینگەکان لای خۆت دیاری بکەیت، کە دەبنە مایەی کێشەو جێگەی سەرنج.

رەنگە هەندێکمان سەلیقەی ئەمجۆرە دانیشتن و گوێگرتنانەمان نەبێت کە منداڵ لەکاتی سەیرکردنی تەلەڤیزیۆن وەکو مەعریفەی سەرەتایی خۆیان پیشانمان دەدەن، هەرچۆنێک بێت ئەمەی سەرەتای دروست بوونی رۆشنبیری راگەیاندنە لای منداڵان. دوور نییە هەندێک شت ئێمەی گەورە تەنیا لەرێگەی سەرنج و قسەکانی منداڵان لەکاتی سەیرکردنی تەلەڤیزیۆن دەرک پێبکەین. کەوایە بەشداری کردنی منداڵان لەسەیرکردنی تەلەڤیزیۆن رۆشنبیرییەکی هاوبەش لەنێوان خێزان و منداڵ و پرۆگرامە پەروەردەییەکان دروست دەبێت.

بۆئەوەی منداڵەکان سەیرکەرێکی رەخنەگری تەلەڤیزیۆن بن، پێویستە زۆر بە گرینگی و بایەخەوە ریز لەقسەو بۆچوونەکانی بگریت، راستە هەندێک لەقسەکانی دوبارەو ژاوەژاوە، وەلێ گرینگە بۆ دروستکردنی ئەم بۆچوونە، کە منداڵ رەخنەگرانە سەیری تەلەڤیزیۆن بکە، بایەخ بە بۆچوونەکانی بدەو گوێ لێبگرە.

## قسەکردن:

قسەکردن دەربارەی شتەکانی نێو تەلەڤیزیۆن و بەرنامەکانی و شیکردنەوەی پرۆگرامەکان بۆیان هۆکارێکی سەرەکییە منداڵ بتوانێت خێراتر وەکو بینەرێکی رەخنەگرانە سەیری بەرنامەکان بکات. گرینگ نییە چۆن سەیری تەلەڤیزیۆن دەکات، بەلکو گرینگ ئەوە سەیری چ جۆرە پرۆگرامێک دەکات، ئەو شتانەی سەیریان دەکات چەندە هاوکاری دەکەن رۆشنبیری خۆی لەسەر گەشە پێبدات. واتە پرۆگرامەکان چەندە هاوکاری منداڵ لەروی پەروەردەییەوە دەکەن. ئەمانە پێویستان بەقسەکردن هەیە.

تۆ ناچیت باسی پێکێنەرو دەرهێنەرو کارەکتەری نێو پرۆگرامەکانی بۆ بکەیت، تۆ ناچیت باسی ئایدیۆلۆژیای بەرنامەکانی بۆ شی بکەیتەوە، نەخێر تۆ لەرێگەی پرسیارکردن و وەڵامدانەوە باسی روداوو کێشەو پێشهاتەکان دەکەیت.. تۆ باکرێت وەکو کۆڕ گێڕێک، یا باوکسالارێک، یاخود دەسەڵات بەدەستێکی پڕ ئیش و بەرنامە، لەقسەکردندا فەرمان بەسەر منداڵاندا بدەیت. نەخێر دابەزە ئاستی رۆشنبیری منداڵەکەت و بەنەرمی و هێوری وەکو هاورێیەکی و ساکارانە بیدوێنە.

مەرج نییە بی هۆ و لەهەموو کاتێک منداڵەکە بە باسوخواسی تەلەڤیزیۆن و پرۆگرامەکانی گێژ بکەیت.. ماوە ماوە دەرفەتی گونجاو بدۆزەوە تا بەکورتی و سادەیی گفتوگۆ دروست بکەیت.. واتە پێویست بە خۆتەناگوکردن و کاتگرتن و فسار بۆهێنان لەکاتی دواندنی منداڵ ناکات. رەنگە دوای سەیرکردنی پرۆگرامەکە، لە پیاسەیەکی دەرەوە قسەلەسەر روداوەکان بکەن. یا کاتێک منداڵەکە خۆی دەیەوێت باسی بەرنامەکە بکات.. واتە دەرفەت دروستکردن بۆ قسەکردن، لەئامانجی قسەکردنەکە کاریگەرترە بۆ ئەوەی کەشوهەوای یەکتر دواندن دروست بکرێت.

بۆ خولەکێک بیر بکەوە کاتێک خۆت سەیر پرۆگرامێک یانژی فیلمێک دەکەیت بە چ شێوازو جۆرێک دەتەوێت هەستونەستی خۆت بگەینیتە دەوروپشتت.. منداڵیش وایە.. یانژی بگەرێوە سەردەمی منداڵی بیر لەو روداوانە بکەوە کە پیویستی دەکرد، دەربارەیان بدوێت، بەلام کەس نەبوو گوێت لێبگرێت..سەیرکردنی تەلەڤیزیۆن و قسەکردنیش لەبارەیەوە دەگەڵ منداڵان هەمان شتە.

## چی بڵێین لە کاتی دوانی منداڵ دەربارەی تەلەڤیزیۆن

بۆئەوەی ڕێگەی کارەکانمان ئاسنتر بێت دەکرێت لەڕێگەی دوانی منداڵەکەکە کۆمەڵێک پرسیار بکەین کە دەبنە هاوکار بۆ تێگەیشتن و چۆنیەتی دۆزینەوەی ڕێگە بۆ قسەکردن لەگەڵ منداڵەکە دەربارەی پرۆگرامەکانی نێو تەلەڤیزیۆن.

- ئایا حەزت لە بەرنامەکە هەبوو؟ بۆ بەڵی، بۆ نەخێر؟
- هێچ شتێک لەبەرنامەکە بێزاری کردیت، یاخود وای لێکردی هەست بکەیت خراپە؟
- کارەکتەرەکان چۆن بوون؟
- ڕوداوەکان چی بوون، بەسەرهاتەکە چی بوو؟
- تۆ چۆن خورەوشتی کارەکتەرەکانت بینی؟ ئایا هیچ شتێک هەبوو ناشیرن بێت؟
- چارەسەری کێشەکان چون بوو، توا رات لەسەر چارەسەری کێشەکان هەبوو؟
- ئەو شتانەی رویان دا ئە راستی بوون، یاخود تەنیا فیلمە؟ ئەگەر راستین چۆن و ئەگەر راستی نین چۆن؟
- ئەگەر تۆ کارەکتەری نیو بەرنامەکە بی چی دەکەیت؟
- باشە ئەگەر تۆ نووسەری بەرنامەکە بیت و شتەکان تۆ بینووسیت چۆنی دەنووسیت؟
- چ شتێک لە بەرنامەکە فێر بوویت؟
- حەز دەکەیت بەشێک بیت لە بەرنامەکە؟

## گوێگرتن:

بەشێکی تر ئەو رێچکە پەروەردەییەی خێزان ومنداڵ دەربارەی تەلەڤیزیۆن میتۆدی گوێگرتنە لە منداڵ لەکاتی سەیرکردنی بەرنامەکان، یاخود دواتر. لەم بوارەوە چەندین کتێبی تایبەت بەزمانی ئینگلیزی چاپکراوە، تا هاوکاری خێزان بکەن چۆن دەتوانن گوێ لەمنداڵەکانیان بگرن.

کارێکی سەختە لە کۆمەلگایەکی دواکەوت و پڕ لەململانێی کۆمەلایەتی منداڵ گەیشتبێتە ئاستێکی وەها دایک وباوک و گەورەکان فێری ئەوە بووبن چۆن گوێیان لێدەگرن.. دواین شت ئەوە بایەخ بە قسەو گفتوگۆکانی منداڵ بدرێت.

ئەمە رێگەیەکی گرینگە بۆ پەروەردەکردنی تەلەڤیزیۆنی، چونکە لەلایەک هاوکاری منداڵ دەکرێت چۆن گوێ لە بەرنامەکان دەگرێت ولێیانەوە فێری شتی تازە دەبێت، لەهەمان کاتیشدا رێبەرایەتی خێزان و کۆمەلگا دەکرێت چتۆ بایەخ بە گوێگرتنی راو قسەکانی منداڵان بدەن. واتە کاتێک سەیری رواود جولەکانی نێو تەلەڤیزیۆن دەکرێت، منداڵ دەتوانێت بەپێی خەیاڵ و توانای لێکدانەوەو ژیری خۆی

شتەکان لێکبداتەوە، بەلام کاتێک گوێدەگرێت، دەتوانێت رووداوەکان بناسێت و زاراوەو وشەی نوێ فێر بێت و وریاتر شتەکان بەکاربهێنێت.

زۆر گرینگە گوێ لەمندالْ بگریت ولەکاتی قسەکردنیشدا وریا بە هەستونەستی بریندار نەکەیت، چونکە ئەگەر ئەم هەستەی لادروست بوو، واتە تێدەگات کە تۆ بایەخی بە قسەکانی نادەیت و ئامادە نیت گوێی لێبگریت. هەولدە لەکاتی گوێلێگرتن پرسیاری لێبکەیت و تێیبگەیت.

وەکو (لەورین ئاکسلۆرد) دەلێت (٢٦) پێویستە بوڕا بهێنین کە تەلەڤیزیۆن کاتێک قسە بۆ مندالْەکانمان دەکەین کە لەسێ رووەوە تەلەڤیزیۆن نباسرێت:

یەکەم: تەلەڤیزیۆن شتێکی راست نییە، بەلکە تەنیا ئەوەیە کە بەچاو دەیبینین.

دووەم: شێوەیەکە لە بڕواو پەیوەندی و بیرڕاو خورەوشت.

سێیەم: کارێکی بازرگانییە.

(٨)

## منداڵ لەنێوان پروپاگەندەو ئایدیۆلۆژیاو ئیعلانکردندا

دەزانین تەلەڤیزیۆن پەیوەندی بە بازرگانی کردن ودروستکردنی پارەو بازرگانی کردنەوە هەیە.. تەلەڤیزیۆن یەکێکە لەو دەزگاراگەیاندنانەی بایەخی زۆرو سەرەکی بە ئعلان و پروپاگەندە دەدات، چونکە لەم رێگەیەوە پارە دروست دەکات. بەتایبەتی لە ولاتە ئازادەکاندا کە تەلەڤیزیۆن وەکو ناوەندێکی بازرگانی و پرۆژەی ئابوری کاردەکات، لەرێگەی پرپاگەندەی بازرگانی و ئیعلانکردنەوە درێژە بەژیان و راکێشانی پتری بینەرەکانی دەدات. بۆیە ئاساییە منداڵان ئەم شتانە ببینن و بەرنامە تایبەتیەکانیاشیان پڕ بێت لەمجۆرە ئیعلانانە.

جیمیس ماکنیەل پرۆفیسۆر لە زانکۆی ئەی – ئێم لە تیکساس دەڵێت ئیعلانی منداڵان کاریگەریەکی زۆری لەسەر بازرگانی هەیەو ساڵانە ٥٠ ملیۆن دۆلار خەرج دەکرێت و دایک وباوک و داپیرەو

باپیرەش ساڵانە ١٦٠ میلۆن دۆلار خەرج دەکەن و ژمارەی منداڵانی ئەمەریکا  کەلەماڵدا دەژین پێوسیتان بە ٣٤٠میلۆن دۆلار دەبێت لەساڵیکدا بۆکڕینی سابون تا دەگاتە ترۆمبیل(٢٧). ئەم باسە بۆ ئەوەیە بایەخ  وکاریگەری ئیعلان لەنێو پرۆگرامەکاندا دیار بخەین. بۆیەشە گەلێک لەتەلەڤیزیۆنەکان کاردەکەن بۆ پڕفرۆشکردنی کەلوپەل و پیداویستییەکان منداڵان پەنا بۆ ئیعلانکردنی بازرگانی لەنێو بەرنامەکانی منداڵان ببەن. دیارە ئەمە تەنیا لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا روندات، بەلکە گەلێک وڵاتی تریش هەمان سیستەم دەنێو پرۆگرامەکانی منداڵان بەکار دەهێنن.

ئیعلانکردن لە نێو پرۆگرامەکانی مندالان بۆچی و چی دەگەیێنێت؟ زۆربەی منداڵان ئەوە نازانن بۆچی لەنێوان هەر هەر ٧ تا ١٠ خولەکدا لەکاتی سەیرکردنی پرۆگرامەکانیاندا بڕگەیەکی ریکلام کردن بۆ ماوەی ١٣ چرکە دادەنرێت.  مندالان ئەوە نازانن کە دەنێو پرۆگرامەکانیاندا بازرگانی کردن هەیە، لەرێگەی دەنگ  وێنەوە دەیانەوێت سەرنجیان بۆ فرۆشتن و پەیداکردنی کڕیار رابکێشن. واتە ئەو بەرنامانەی سەیری دەکەن و ناوە ناوە دەپچڕین، بازرگانی کردنە.

ریکلام کردن دەنێو هەموو پرۆگرامەکانی تەلەڤیزیۆندا خۆی پەنا داوە، تەنیا لەنێو پرۆگرامەکانی دەنگوباسیشدا خۆی مەلاس داوە. هەندێکجار دەنێو خودی ریکلامەکەدا ریکلامی تر سەر دەردەهێنێت. لاتان شاراوە نییە، تەکنیکی ریکلام  رۆژ بەرۆژ لەفرە بوون دایەو هێزی فرۆشتن پتر پتر دەکات. بۆ یە ئاياسييە لە وڵاتێکی وەکو ئەمەریکا هەفتانە رێژەی بینەرەکانی ئەو تەلەڤیزیۆنە بەناو بانگانەش بلاوبکرێنەوە کە بینەرەکانیان بە ملیۆنان کەسە.

له ئەمەریکاد ا ساڵی ١٩٩٦ بەپێی یاسای فیدرالی، تەلەڤیزیۆنە حکومییەکان وئەوانەی بایەخ بە پرۆگرامی پەروەردەیی و کەنالی خێزانیان هەیە، دەتوانن لەهەر نیو سەعاتێکدا ٨ خولەک پروپاگەندەو ریکلام بلاوبکەنەوە، واتە لەماوەی نیو سەعاتدا ١٦ ریکلام دەبینێت. واتە منداڵ لەماوەی ١سەعاتدا ١٦ خولەک دەبێت چاوی بە ریکلام بکەوێت، هەروەسا لەماوەی١ سەعاتشدا ٣٢ ریکلام دەبینێت. بەپێی ئەم یاسایەو رێبازەی تەلەڤیزیۆنەکان پیادەی دەکەن منداڵ ساڵانە لەسەرووی ٤٠٠٠٠ ریکلامی جودا جودا دەبینێت و تا منداڵ دەگاتە تەمەنی ١٨ ساڵی بەتێکرایی و بەشێوەیەکی گشتی نزیکەی ٧٠٠٠٠٠ ریکلام دەبینێت (٢٨).

بۆ ئەوەی هەندێک لەزانیارییەکان پتر بکەین، با دیقەت لە رێژەی سەرفکردنی پارە لەبواری ریکلام لەتەلەڤیزیۆنەکانی ئەمەریکا لەساڵی ٢٠٠١ بدەین. پێتان وانییە ئەم رێژە زۆرەی لەبواری ریکلام سەرف دەکرێت ساڵانە لەتەلەڤزیۆن و دەزگاکانی راگەیاندندا بەشی نان و خواردەمەنی چەند ملیۆن منداڵی برسی و بێجێگاو بێ سەرپەرشت بکات. ئێمە ئامانجمان بەراوردکاری نییە، بەلکە دەمانەوێت بایەخی خۆبەرێوەبەری و کاریگەریەکانی تەلەڤزیۆن لەسەر منداڵ بزانین. ساڵی ٢٠٠١ ریکلامی تەمەن ٤٦ ملیۆن دۆلاری خەرج کردووەو Anheuser- Busch

٢٨٥ ملیۆن دۆلاری خەرج کردووە بۆ بەرزکردبەوەی ئاستی لایتی خراپ و هەروەها کۆکاکۆلا ٣٥٧ ملیۆن دۆلارو و شیر بەگشتی ٥١٠ ملیۆن دۆلار و بێگل و دۆف بۆی و چیپس و میکدانۆس تێکڕا٥٩٠ ملیۆن دۆلارو کۆپمانیای پیپسی ٥٧٠ ملیۆن دۆلاراین بۆ

ریکلام تەرخان کردووە. کە نابێت پێمان سەیر بێت تەلەڤیزیۆنی ئەمەریکی ساڵانە بە ملیۆنان دۆلاری بۆ ریکلام تێدا تەرخان دەکرێت و هەروەها دەزانیت هەربینەرێک ساڵانە لەنیوان ۱۰۰۰۰ و ۲۰۰۰۰ ریکلامی پیشان دەدرێت.(۲۹)

مەرجیش نییە هەموو کاتێک کەناله جوداکان بتوانن ئامانجی دروستکردنی پارە دروستکردن بپێکن لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا ۵۰۰ کەنالی جودا هەیە، هەمووشیان کار بۆ پەیداکردنی بینەرو درووستکردنی پارەو بلاوکردنەوەی ریکلام دەدەن، بەڵام چۆن.. بەرێگەی خۆیان و ئەو شێوازە نوێیانەی رکابەرایەتی چاکتر بەرێوە دەبات بۆ دروستکردنی پرۆژەی ئابوری. تەنیا وای لێهاتووە، کەسانی تایبەت بە ریکلام دەبێت خودانی بڕوانامەی زانستی و ئەزمونی چاک بن، بۆ دەستخستنی کار. کە دواتر ئاماژەی پێدەکەین، چۆن لەریگەی ریکلامەوە دەبنە خودانی پارەو نێوبانگ. بەڵام هەموو کاتێک پرۆگرامەکان سەرکەوتوو نابن، وەکو دێیڤید وەستن دەڵێت خەڵک دەیەوێت بگەرێتەوە ماڵ ئیسراحەت بکات و پشوو بدات بەهۆی تەلەڤیزیۆنەکەیەوە، نایانەوێت پرۆگرامێکیان هەبێت کتومت خۆیان بن. لەکاتێکدا لەرێگەی ریکلامەکانی تەلەڤیزیۆنەوە مندالان بەدەیان جار ئەگەر وریا نەبین چاویان بە مەیی و خواردنەوە دەکەوێت، هەرچەندە لە ولاتە یەکگرتووەکان خەڵکی سەرووی تەمەن ۲۲ سالی ئازادن لە کڕین و خواردنەوەی مەی، بەڵام پێش ئەم تەمە دەستی پێدەکەن، ریکلامەکان، فیلم و پرۆگرامە جوداکان کاریگەریان لەسەر هەلبژاردنی خوردانەوە هەیە، وەکو چۆن زۆرجار لەهەندێک کۆمەلگای تردا قەدەغەکردن هۆکار دەبێت، بۆ پاڵنانی خەڵک تاکو شتە

بڤەو قەدەغەکراوەکان بەکاربهێنن. بابزانین سالی ٢٠٠٣ چەند ریکلامی مەی و خواردنەوە لە ئەمەریکا ئەنجام دراوەو چەندە گۆران لە رێژەو ژمارەی ریکلامەکان رویداوە. ساڵی ٢٠٠٣ ٢٩٨٠٥٤ جار ریکلام مەی لە کەنالەکان بڵاوکراوەتەوە کەچی سالی ٢٠٠٢ ٢٨٩٣٨١ جار بووەو ساڵی ٢٠٠١یش ٢٠٨٩٠٩ جار ریکلام بینراوە. وەکو سەرچاوەکان ئاماژەیان پێکردووە رێژەی بلاوبوونەوەی ریکلامی مادەی سەرخۆشکەری وەکو مەی لە ساڵی ٢٠٠١ کە٥١٣ بووە بۆ ٣٣١٢٦ بەرزبۆتەوە لە ساڵی ٢٠٠٣. (٣٠)

رەنگە ئەم باسە گەلێک نەچێتەوە سەر ریکلام بەڵام پەیوەندی بەدروستکردنی پارە هەیە، با باسی رێژەی فرۆشتنی سی دی بکەم کە تایبەتە بەبەرهەمەکانی دکتۆر سوس، دکتۆر سوس بەرهەمی منداڵانە، ئەم بەرهەمانە لەرێگەی دی ڤی دی تەنیا فیلمی دکتۆر سوس کەلەساڵی ١٩٥٤ نووسراوە ساڵی ٢٠٠٨ لە سینەمادا ٢٩٥.٢ ملیۆن دۆلار تیکێتی فرۆشت. واتە لەم ولاتانەدا بەرهەمەکانی منداڵان وەکو پرۆژەی پیشەسازی و ئابوری سەیریان دەکرێت. (٣١)

با ئاماژەیەکی خێرا بە یەکێک لەکەسە تایبەتمەندەکانی ریکلام لەکەنالی بەنێوبانگی ئێن بێ سی ئەمەریکی بدەین کە نێوی شوگەرە.. بەپێی هەوالێکی رۆژنامەی نیۆرک تایمز شوگەر کە سەرپەرشتی ریکلامیەکانی نێتوۆرکی کەنالی ئێن بی سی لە بواری جلوبەرگ و کێک و شیرنەمەنی دەکات و لە ساڵی ٢٠٠٧ەوە نزیکەی ١٠ ملیۆن دۆلاری کارکردووە، بەنیازە خۆی خادەنداریێتی ئەم بەشەی ریکلام بکات و دەڵێت (ئێمە زۆر گەشەمان کردووە). برەین شوگەر لە ٥٠%ی داهاتی ریکلامەکانی بەردەکەوێت، واتە بەقەد موچەی هەموو موچەخۆرانی ئەم بەشەی

لەساڵی ۲۰۰۷دا بەرکەوتووە. بابزانین بەپێی هەمان سەرچاوەی سەرەوە لە مانگی تەموزی ۲۰۰۸ برەین شوگەر لە نێو نێتوۆرکی ئێن بی سی دا چەند کەس  لەرێی ئەنتەرنێتەوە سەردانیان کردووە، لە تەموزی ۲۰۰۸دا ٤.٦ ملیۆن کەس سەردانی شوێنی شوگەریان لە ئەنتەرنێت کردووە، ئەم رێژەیەش ١٢١% بەرەو سەر چووە، لەچاو سەرەتای ئەمساڵدا، کە تەنیا ٢-١ میلۆن کەس سەریان لە شوێنی تایبەتی شوگەر لەئەنتەرنێت دا بوو. لەمبارەوە گوتیەتی (دەربارەی پەروایز، ئەمە تەنیا رێگەیە بۆ ئەوەی لەرێگەی ریکلامەوە پارە دروست بکەین.. ئێمە ئێستا بەرەو سەر گەشە دەکەین). (٣٢)

لەبیرمان نەچێت مۆسیقاو گۆڕانیش بەشێکە لەم دونیایە، ریکلامەکان کارێکی زۆری تێدا دەکرێت مۆسیقاو سەماو گۆڕانی بۆ منداڵان تێدا بەکار بهێنرێت، تاکو سەرنجیان پترو پتر بۆ کڕینی شتەکان رابکێشن. هەروەسا لەبیرمان نەچێت خودی بەرهەمە مۆسیقاییەکانیش بەشێکە لە پرۆسەیەکی ئابوری و کاردەکرێت بۆ دروست کردنی پارە لەرێگەی بەرهەمی نوێ. گۆرانی  ومۆسیقای منداڵانیش وەکو هەر شتێکی تر بەرهەمە. ساڵی ۲۰۰٦  بەپێی سەرچاوەکان سی دی گۆڕانی منداڵان کەناوی (ئەو شەمەفەندەفەرە بگرە)، ۸۵۰۰۰ دانەی لێفرۆشراوە، راستە ئەم ژمارەیە نەگەیشتۆتە ئاستی فرۆشتنەکانی مۆسیقای قوتابیانی قۆناغی ئامادەیی کە دیزنی بەرهەمی هێناون، بەڵام لەگەشەکردنیشدان.

**رۆژنامەی .(٣٣)**

مەبەست ئەوەیە چۆن خەلک لەرێگەی ریکلام و بەکارهێنانی کەنالەکانی تەلەڤیزیۆن و ئەنتەرنێت دەیانەوێت پارە دروست بکەن و پرپاگەندە بۆ فرۆشتنی کەلوپەل و خواردن و بەرهەمە پیشەسازییە جۆربەجۆرەکان بکەن.

بۆیە لەکاتێکدا راگەیاندن شوێنی بەرزو گرینگ لەنێو گۆرانە کۆمەلایەتییەکان دەگێرێت و سەرچاوەیەکی گرینگی بازرگانی و ئابوریشە،وەکو پرۆسەیەکی ئابوری بەرچاویش کاردەکات، لەهەمان کاتیشدا بۆتە سەرچاوەیەکی پڕ ترس و پرسیار بۆ ژیان و تەندروستی ئەو منداڵانەی رۆژانە بۆ ماوەی کاتژمێری زۆر و درێژ سەیری شاشەی میدیاکان دەکەن، بەتایبەتیش تەلەڤیزیۆن.

ئەمە بەشێکە لە سیستەمی ژیان و بەرهەمهێنانی بازرگانی و پیشەسازی لەنێو کۆمەلگایەکی وەکو ئەمەریکا. بۆیەشە ئاساییە بۆ سەرنجراکێشانی منداڵەکانیان و سود وەرگرتن لەتەکنیکی ریکلام و بێزار نەبوونیان لەم جۆرە پرۆگرامانەی کە لەنێو پرۆگرامە ئاساییەکان ئاخنراون و بۆ سەرنراکێشانی بینەران، تا شتەکانیان بکڕن. منداڵەکانیان لەسەر چەند چالاکیەک رادەهێنن، وەکو ئەم چەند پرسیارانەی خوارەوە:

چالاکی ڕاهێنانی منداڵ لەسەر ریکلامەکان

- چۆن دەتوانیت هەندێک شت بڵێت دەربارەی ئەم ریکلامە.
- هیچ ریکامێکی تر هەیە و لە کوێیە؟
- ئایا تۆ سەرسام بووی بەهەموو ئەو ریکلامانەی بینیت؟
- چەند ریکلامت بینی لەکاتی سەیرکردنی پرۆگرامەکە؟
- ئایا تۆ دەزانیت بۆ ئەم ریکلامە لێرە بڵاوکرایەوە؟
- ئایا خەلک و بینەر تا چەند کاریگەر دەبن، بەبینینی ئەم ریکلامانە؟
- ئایا تۆ چەند کاریگەر بووی بەبینینی ئەم ریکلامانە؟ (٣٤).

بەلام کاتێک دەمانەوێت باسی تەلەڤیزیۆنەکانی خۆمان ومەسەلە پرپاگەندە بکەین، مەسەلەکە بە ئاقارو ڕەوتێکیتردا دەچێت. لەوڵاتە یەکگرتووەکان پرپاگەندە بازرگانییەو پارە دروست دەکات، لای ئێمە کار بۆ پروپاگەندەی سیاسی وئایدیۆلۆژی و عەقایدی دەبردرێت. زۆربەی بەرنامەکان پراوپڕن لە پرپاگەندەی ڕاستەوخۆو ناراستەوخۆ بۆ (حیزب و گروپ و دەستە و بیررای سیاسی ودینی ) جودا. تەنیا پێچەوانەی ئەو ریکلامە بازرگانیانەی کە لەماوەی هەر ٧-١٠ خولەکێک لە تەلەڤیزیۆنی وڵاتە دیموکرات و دەزگا بازرگانەکان دەبینرێت، لە ڕۆژهەڵاتدا لەهەر ماوەیەکی کورتدا پروپاگەندە بۆ (سەرۆک و دەسەلاتی تاقانە و دیکتاتۆرو کەسایەتی و گروپچیەتی) دەبینرێت.

واتە لەکاتێکدا منداڵانی ئەمەریکا کێشەیان دەگەڵ زۆری ریکلام لەنێو گشت پرۆگرامەکاندا هەیەو خێزان پێوسیتە سەرنجیان بۆ

کارێکی پەروەروەردەیی رابکێشن لەرێگەی پرسیاری لەمەچەشنەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد. لەولاتە داخراوو دواکەوتووەکاندا ئەرکی تەلەڤیزیۆمی پەروەردەیی و کاری خێزان قورستر دەبن. چونکە کارێکی پڕ ترسە منداڵ لەسەر ئەوە رابهێنرێن کە دەبێت بە بیروباوەری خۆپەرستی و پیرۆزسەیرکردنی تاکەکەس و پرسیار نەکردن لە دوبارە بوونەوەی وێنەکانی سەرۆک و ... تد.

راستە خەریکە لە تەلەڤیزیۆنەکانی کوردستانیش جۆرێک لەریکلام دروست دەبێت، بەلام ئێمە نەگەیشتونەتە ئەم ئاستە منداڵەکانمان بەم کێشەیەوە خەریک بکەینة، تەنیا ئەوە نەبێت کە پێویستە منداڵ لە ترسی پرپاگەندەی سیاسی وئایدیۆلۆژی و دینی دوور بخرێنەوە، تاکو پروپاگەندە سیاسیەکان ترس و تۆقان و کەسێتی نەگونجاو دروست نەکەن.

## تەلەڤزیۆن

## دەسەڵات

پروپاگەندەی سیاسی      لەقالبدان    تاکپەرستی
ترس      تۆقاندن

## خێزان

دابران لە رۆشنبیری      بێدەنگی      ملکەچکردن

## منداڵ

کەسێتی شێواو
توندوتیژ
نیگەران
تورە

بۆیە کاتێکی گرینگە بۆ دروستکردن و هاوکاری دورست لەنێوان تەلەڤیزۆن و منداڵ و خێزان ئەمجۆرە پرۆگرامە پەروەردەیانە بەرهەمبهێنرێن کەدەبنە مایەی گەشەپێدانی کەسێتی منداڵ و رۆشنبیری راگەیاندن و زانیاری خێزان لەچۆنیەتی مامەلەکردنی زانستیانەو سەردەمانە دەگەڵ منداڵ و دەوربەری.

دیارە نابێت لەبیرمان بچێت کۆمەلگای ئەمەریکی لەسەربنەمای فرۆشتن وکارکردن بەرێوە دەچێت، بۆیەشە ئاساییە لەنێو بەرنامەکانی منداڵانیشدا ریکلام و پرپاگەندە بۆ فرۆشتن وپەیداکردنی کڕیار بکرێت، ئەوان دەیانەوێت منداڵ لەتەک خەرج کردنی پارە، بەهای ئەمجۆرە ریکلامانە بۆ دروستکردنی پرۆژەی پیشەسازی و کارکردن فێر بن. واتە هانی خێزان دەدەن گفتوگۆ دەربارەی ریکلامەکان لەگەل منداڵ بکەن، دەربارەی بایەخ و بەهای فرۆشتن.. کەئامانجی سەرەکی ریکلامەکانە.

بەڵام پێچەوانەی ئەوە ریکلامەکانی ئێمە کە پتر سیاسن و بە ئایدیۆلۆژیا رازێنراوەتە، هانی خێزان دەدەن، چۆن منداڵەکانیان لە رۆشنبیری سەردەمانە دابڕن و ملکەچی ئەو رەوتە سیاسییەیان بکەن، کە خۆیان تێیدا گەورە بوون و لەئاکامیشدا کەسێتی منداڵ شێواو دابراو لە سەردەم و بەها سەربەخۆکانی پێکهێنانی کەسێتی گونجاو دیار بکەوێت. کە هەندێکیشیان لەسایەی پرپاگەندەکانی تەلەڤیزیۆنە جوداکان دوجاری توندتیژی و نیگەرانی و تورە بوون دێن.

(٩)

# تەلەڤیزیۆن و توند تیژی

یەکێک لەو ترسە گەورەو رۆژانەیەی خێزان لەهەمبەر بەکارهێنانی تەلەڤیزیۆن لەلایەن منداڵ و هەرزەکاران هەیانە، مەسەلەی توندوتیژی و بڵاوبوونەوەی ئەو فیلم و پرۆگرام و گەمە ڤیدیۆیانەیە کە پڕیەتی لەشەڕو کوشتارو وخوێن رشتن. بەتایبەتیش لەو کۆمەلگا ئازادنەی سانسۆر لەسەر بەرهەمی فکری و چاپ و بلاوکردنەوە نییەو میدیاش بۆتە پرۆسەیەکی بازرگانی و پرۆژەی پیشەسازی گرینگ، ئەمجۆرە بەرهەمانە کە رێژەی نیگەرانی و ترسی خێزانیان لەبەکارهێنانی تەلەڤیزیۆن پتر کردووە، خەریکە ئاراستەی ئەم تەکنەلۆژیا سودبەخشەه بۆ ترس و نیگەرانی ببات.

دەمەوێت کۆمەڵگای ئەمەریکی وەکو نمونە باس بکەم، کە ڕێژەی بەکارهێنانی ئەمجۆرە فیلم و بەرنامە خوێناویانەی تێدا لەزیاد بوونە، بەتایبەتیش لەلایەن منداڵانی تەمەن ٢ تاکو ١٨ ساڵی. بەپێ سەرچاوەکان ٥٧%ی پرۆگرامەکان بەگشتی بەجۆرێک لەجۆرەکان توندوتیژی و خوێنی تێدایە. کەناڵە سەربەخۆکان خوێنرێژی بە ڕێژەی ٨٥% و نێت وۆرکەکان بە ڕێژەی ٤٤% و تەنیا کەناڵی پی بی ئێس کە تایبەتە بە منداڵان بەرێژەی ١٥% بەرنامەکانی خوینرێژی تێدایە. بەرنامەکانی تەلەڤیزیۆن لەئەمەریکا زۆرتر لەهەموو تەلەڤیزیۆنێکی تر لە دونیا خوینرێژی تیدا هەیە، هەروەها زۆربەی ئەمەریکیەکان بروایان وایە ئەم فیلمانە بەرەو ژیانێکی لەمجۆرەت دەبات.(٣٥).

سەرچاوە تەندروستییەکانی ئەمەریکا گوتویانە ئەو منداڵانەی زۆر سەیری فیلمی خوێناوی لەتەلە ڤیزیۆنەکان دەکەن دوجاری ترس و بێ متمانەیی و بی بڕوایی دێن. هەورەها ڕۆژنامەی لۆس ئەنجلس لە ڕاپۆرتێکدا بلاوی کردۆتەوە کە ٩١% ی ئەو منداڵانەی سەیری ئەمجۆرە پرۆگرامانە خوێناویانەی تەلەڤیزیۆن دەکەن، هەست بە (دڵتەنگی و توڕەیی) یاخود (ترسان) دەکەن. زانکۆی پەنسلڤانیاش لە لێکۆلینەوەکانی خۆیدا دەربارەی کاریگەری زۆرو ڕاستەوخۆی ئەمجۆرە پرۆگرامانە لەسەر منداڵان دەریخستوە کە پرۆگرامەکانی تەلەڤیزیۆن لەماوەی هەر کاتژمێرێکدا ٢٠ کاری توندوتیژی خوێناویانە پیشان دەدات. سەرچاوەی تەندروستی ئەمەریکی کەپێی دەگوترێت ئەمەریکا فسیۆلۆجیکەل ئەسۆسیەشن (ئەی پی ئەی) کورتکراوەیەتی دەڵێت ئەو منداڵانە پتر حەز دەکەن هەلسوکەوتی دوژمنکارانە (aggressively).

ئەنجام بدەن. ئەو مندالانە پتر مەیلی لێدانیان و رکابەری و لەدەستدانی دانبەخۆداگرتن و بایەخنەدان بەتەواوکردنی شتیان لادروست دەبێت.(٣٦)

یەکێک لەو هۆکارانەی کەئەمەریکا باوە زالی و هێزی میدیایە، کە وادەکات منداڵ لەتەمەنی جودا تاموتۆی سەیرکردنی تەلەڤیزیۆن و دانیشتن لەبەردەم شاشەی لابەهێز بێت، سەرباری ئەو ترسەی زۆرەی منداڵ لە چوونە دەرەوە و یاریکردن لەگەرەک هەیەتی، چونکە هیچ منداڵیک ئاسایشی تەواوی نییە، کە چووە دەرەوە روبەروی کێشەو شەڕو دزین و هەتا رفاندنیش نێت. لەبیرمان نەچێت دایک وباوکیش بەهۆی مژولیان بەکار، رەنگە ئەو دەرفەتە گونجاوەیان نەبێت منداڵ بتوانێت یاری بکات و بچێتە دەرەوە، بۆیە ئاساییە لەحالەتی وەهادا منداڵ دەگەڵ شاشە ئاشنا بێت و کاتێکی زۆر لەبەردەم شاشە بەسەر ببات. سەرچاوەکان گوتویانە منداڵی ئەمەریکی کاتێکی زۆر درێژتر لە کاتی خەریک بوون بە کارو ئەریکی قوتابخانە لەبەردەم شاشە بەسەر دەبەن. کە لێکۆلینەوەکان دەریان خستوە (رۆژانە منداڵ بەتێکڕایی ١٣٥ خولەک بە مژول بوون بە میدیا بەسەر دەبات و تەنیا ٥٧ خولەک بۆ جێبەجێکردن و راپەڕاندنی ئەرکی قوتابخانە تەرخان دەکات)(٣٧).

ئەمجۆرە بەرنامەیە کاریگەری راستەوخۆی لەسەر هەلسوکەوتی خێزان و منداڵ بەتێکرایی دەبێت، بۆیە لەحالەتی ئێستادا کار دەکرێت منداڵ لەمجۆرە بەرنامەو پرۆگرامانە دوور بخرێنەوە کە پراوپڕی توندتیژی و خوێنرێژییە. بەتایبەتی لەو کەنالانەی دەیانەوێت هەموو

شتێک بەرەو فرۆستن و قازانج ئاراستە بکەن، هیچ جۆرە سانسۆریک لەسەر پرۆگرامەکانیان دانانێن. ئەمەریکا ولاتێکە لەهەموو چرکەیەکدا تاوانی کوشتن و دزی و لێدان وبڕینی باوک و کارەساتی ترومبیل و رفاندن و بزربوونی تێدا رودەدات. بەشی هەرەزۆری روداوەکان بۆ کاریگەری ئەو فیلم و پرۆگرامانە دەگێڕنەوە کە پەنا بۆ توندوتیژی و خوێن رشتن دەبرێت.

یەکێک لەو بەرنامە بەربڵاوەی تەلەڤیزیۆنەکان بەرنامەی خوێنریژی و توندوتیژییە، کە بەتەنیا لەشاشە گەورەکاندا پیشان نادرێت، بەلکە بەسەدان گەمەی ڤیدیۆشیان لێدروست کراوە، منداڵان لەشوێنە گشتیەکان و نێو ترۆمبیل و باس و هاتوچۆو رێگە بەکاریان دەهێنن. ئەمانەش کاردانەوەی سلبی لەسەر هەلسوکەوت و بیرکردنەوەو کێشەی دەروونی لای منداڵ دروست دەکەن. بۆیە ئاساییە لێکۆلەرەوە ئەمەریکییەکان لەسایەی بەربڵاوی ئەمجۆرە فیلم و بەرنامە هەمەجۆرانە کۆمەلگای ئەمەریکی بە توندوتیژ ناوببەن. هەر هێندەش نا بەلکو لەرێگەی راگەیاندن وسینەماوە، هەمان کەلچەریان بۆ سەرجەم دونیا ناردووە.

لێرەدا دەکرێت لەنێو بەرنامەکانی منداڵاندا چەندین جۆری ئەمجۆرە بەرنامانە بدۆزینەوە، بەڵام وەکو لەورین ئاکسلۆرد دەڵێت دەکرێت دوو جۆری سەرەکی ئاماژە پێبکەین کە بریتن لە (خوێنرێژی خەیاڵی وئەفسانەیی و خوێنرێژی بنەڕەتی و ئاسایی). لامان شاراوە نییە، هەردووجۆر کاریگەری سلبی لەسەر باری کۆمەلایەتی و دەروونی منداڵ دروست دەکەن، بەڵام بەرێژەی جودا، چونکە پشت

به میتۆدو روداوو پێکهاتەی جودا دەبەستن.

خەیاڵی وئەفسانە پتر لە هەقایەتی ترسناک و چڕوجانەوەران نزیکە، بۆیەشە ئاساییە کارەکتەرەکان بەشێوەی خەیاڵی دەربکەون و کێش و شێوەیان گەورەترو جیا بێت لەراستی. رەنگە مرۆ نەبن، لەشێوەی گیانەوەرو ترسناک و قارەمانی تایبەت و یا مەکربازو شتی تر دەربکەون. لەروی کات وشوێنیشەوە جیایە، مەرج نییە واقیعی بێت، تەنیا شتی سەرسورهێنەرن. بۆیە زۆر ئاساییە چەکی سەیر سەیرو کردەو هەلسوکەوتی دوور لەعەقڵ و کوشتنی دوور لەخوێنرشتنیش ببینین. گرینگ ئەوەیە ئەمجۆرە بەرنامانە منداڵ بەرەو دونایەکی فەنتازی و سەرسورهێنەر دەبات.

کارتۆن چاکترین نمونەی ئەمجۆرە بەرنامە خەیاڵی و ئەفسانەیانەیە. منداڵان لەگەڵ بینینی هەندێک روداوی لێدان و راونان و کەوتن و هەڕەشە، دوور نییە هەندێک بترسن و نیگەران بن، بەڵام لەکۆتایدا هەست بەتەنگەنەفەسی و ئەو ترس و تۆقانە زۆرە ناکەن، کەلە بەرنامە راستییەکانی پەیوەند بە توندوتیژی دەبینین. لێرەدا دەکرێت ئاماژە بە کارتونی (تۆم و جێری) بکرێت.

لەهەمان کاتدا لەورین ئاکسلۆرد دەڵێت زۆربەی فیلمە کۆنەکانی توندتیژی و خوینرێژیان تێدایە، پشت بەم بۆچوونە دەبەستن وەکو فیلمی (باتمان).

جۆری دووەم خوێنرێژی بنەڕەتی و ئاساییە، ئەمجۆرە بەرنامانە کە لەراستیدا هەن و دوور نییە رۆژانە بیان بینین. روداوەکانی کارەساتی ترمبێل و ئاگرکەوتنەوەو پۆلیس و دادوەرو دکتۆرو تاوانی

کوشتن و دزی .. تد کەئەمانە لەراستیدا وەکو روداوی راستەقینەو ئاسایی هەن. ئەمجۆرە بەرنامانە بەشێوەیەکی گشتی بۆ نیشاندانی روداوەکانی تایبەت بە خوێنرێژی و توندوتیژی بەرهەمهێنراون، ئەگەر روداوەکانیان لێدەربهێنن ئەوە بەچیرۆک ناچن. واتە بەهای سەرەکی و بنەرەتی ئەمجۆرە بەرنامانە لەسەر مەسەلەی توندوتیژی و خوێنرێژی بیناکراوە.

ئەمەریکییەکان زۆر ئارەزووی بینینی بەرنامە وفیمی روداو دەکەن، کە بەشی زۆری ئەو بەرنامە نوێیانەی رودوەکان پشت بە توندوتیژی و خوێنرژان دەبەستن. تەنیا دەرکەوتنی کوشت و کوشتارو روداوە خوێناوییەکانی نیو بەرنامەکانی هەوالیش پشت بەم سەرەتایە دەبەستێت کە لایەنی دووەمی ئەمجۆرە پرۆگرامانە پێکدەهێنن.

کاتێک هەڵسوکەوتی ژمارە گەلێکی منداڵان دەبینین، دەکرێت بزانین کەچەندە زۆرتر کاریگەری فیلم و بەرنامەکانی توندوتیژی بنەرەتیان بەسەردا زالە، چونکە ئەمجۆرە بەرنامە خێراتر و بە هۆرمۆنیای پتر کاریگەری لەسەر منداڵان جێدەهێڵێت. لەهەمان کاتیشدا روداوی واقیعین. منداڵ بەشێوەیەکی ئاسایی دەتوانێت هەستیان پێبکات و بیانبینێت. بەڵام خوێنرێژی خەیاڵی و ئەفسانەیی نابنە جێگەی بروای منداڵان.

## لێرە بەکورتی هەندێک جیاوازییەکان ئاماژە پێدەکەین

خوێنرێژی خەیاڵی- ئەفسانەیی

- دەوروپشت و کەشوهەوای نادیار.
- کاتی نائاسایی.
- مرۆ کارەکتەرو قارەمانی تایبەتی چیرۆکە نییە.
- چەکی سەرسوڕهێنەرو ناماقول.
- رەوشت و میزاجی سەرسورهێنەرو پێکەنیناوی.

خوینرێژی بنەرەتی و ئاسایی

- کەشوهەواو دەورپشتی راستەقینە.
- کاتی دایریکراو.
- کارەکتەرەکان مرۆڤن.
- چەکی راستەقینە.
- روداوی راستەقینەی خوێناوی.
- خوینرژانەکان هۆکارن بۆ روداوەکان.

کاریگەرییەکانی ئەمخۆرە پرۆگرامانە لەگەشەکردنێکی سلبی دایە، دەڵێم گەشەکردن چونکە ئەمجۆرە پرۆگرامانە پێشوازییەکی زۆری لێدەکرێت و بەرهەمهێنانیشی لەزۆربوون دایە، پێچەوانەی ئەوەی کە کاریگەری سلبی دروست دەکات، بەتایبەتیش پرۆگرامە راستەقینەکانی توندوتیژی و خوێنرێژی. ئەمرۆ لەرێگەی هۆلیودەوە دونیا بۆتە بەشێک لە توندوتیژی. ئەمجۆرە بەرنامانە کاریگەریان لەسەر منداڵ وگەورەکانیش هەیە لەروی پەرەپیدانی ترس و زۆرکردنی دوژمنکاری و رق لێبوونەوەو پەرەپیدانی گیانی تۆلەسەندنەوەو روانان و دوچاربوونی لەرێ دەرچوونی کۆمەلایەتی.

ئێمە دەزانین منداڵی ساوا وبچوک لە راستی روداوەکان ناگەن بۆیە ئاساییە هەست بە ترس و تۆقان بکەن، یاخێرا کاردانەوەی ترسهێنەرانە بەهەلسوکەوتەکانیان دەرکەوێت. یانژی گەلێک جاران منداڵ ببینین پەنا بۆ نواندنی بەکارهێنانی دەمانچەو چەک ببات. یاخود خۆی ونیشان بدات یەکێکە لە قارەمانەکانی نێو پرۆگرامەکان و هەولبدات، هاوڕێکانی لەرێگەی بەکارهێنانی هێزو زۆری بترسێنێت. لامان سەیر نەبێت دوای سەیرکردنی هەندێک پرۆگرامی لەمجۆرە منداڵ کە روداوەکان ناگات، پەنا بۆ بەکارهێنانی چەقۆو چەکوش و شتی تر ببات بۆ لێدان وئازاردانی خەڵکی تر.

پەیوەندی بەهێزیش لەنێوان بەرنامەی توندوتیژی و خوێنرێژی و دروست بوونی خورەوشتی دوژمنکارانە هەیە. ئەمجۆرە بەرنامانە هانی منداڵان پتر لەگەورەکان دەدەن گیانی دوژمنکاری و رقلێبوونەوەو تۆلەسەندنەوەیان لا دروست بێت.

دەکرێت بەنمونە باسی منداڵانی عێراق بەر لە بیست ساڵ بکەین،

کاتێک رۆژانە فیلمی راستەقینەی لاشەی کوژراوەکانی بەرەی جەنگی لەتەلەڤیزیۆن دەدیت، ئێستا کە گەورەبووە، گیانی کوشتن و رق لێبوونەوەو دوژمنکاری لا دروست بێت. کاتێک رۆژانە روداوی تەقینەوەو خوێن و لاشەی راستەقینەی مرۆڤ لەهەوالەکان دەبینێت، دوچاری خەمۆکی و تورەیی و ترس ببێت.

منداڵیک کەناوی کارینەو تەمەنی ٦ ساڵە لەبارەی ئەمجۆرە پرۆگرامانە دەڵێت: (ئەوە بەوە دەچێت خەڵک هیچ ئازارێکی پێنەگات کاتێک لەناو تەلەڤیزیۆن گولەی پێدەکەوێت، یا لێی دەدرێت. بەڵام من وادەزانم ئازاریان پێدەگات. بەراستی کاتێک تۆ هەمان شتت بەسەر دێت، ئازار دەبینی. دەبێت خوێنت لێبێت و بگرییێ. جێمی برام بروا ناکات خەڵک خوێنیان لێدێت، کاتێک گولەیان بەردەکەوێت. چونکە لەناو کارتۆندا کەس خوێنی لەبەر ناڕوات) (٣٨).

ئەوەی لەمنداڵە فێری دەبین ئەوە کە هیچ پرۆگرامێکی کارتۆنی منداڵان کە پڕیەتی لەتوندتیژی و خوێنرژان، ئازاری منداڵان نادات و کەسیش وەکو کارتۆنەکان ئازار نابینێت کاتێک گولەی لێدەدرێت، یا لەشوێنەکی بەرز خۆی فرێدەدات، یا تڕومبێلەکەی هەپڕون بەهەپڕون دەبێت. چونکە ئەو هیچ جۆرە ئازارو خوێنێک لەنێو پرۆگرامەکانی کارتۆن نابینێت.. بەڵام ئەمجۆرە پرۆگرامانە دەکرێت ناولێبنێن (برینی بی ئازار).. واتە ئەو ئازارانەی بی ژان و سۆ بەرێوە دەچن، بەڵام لە دوارۆژدا دوور نییە کاریگەریەکانی بەسەر هەلسوکەوت و بیرکردنەوەو خورەوشتمان دیار بکەوێت. شونی برینەکان بە هەلسوکەوتیانەوە دیار بێت.

گەنجێکی تەمەن ١٣ ساڵی کەناوی ماریایە دەڵێت:(من وابیردەکەوە کە خوێنرێژی فێری رولێبوونەمان دەکات. ئازاری خەڵکی تر بدەیت و خراپ بی دەگەڵ خەڵکی. من هەرگیز نەمدیوتە خەڵک لە تەلەڤیزیۆن چاک بن لەگەڵ یەکتری. نامەوێت رقم لەس بێتەوەو لەهیچ کەسیش رقی لەمن ببێتەوە، بەتایبەتی نامەوێت ئازار ببینم)(٣٩).

ئەمەیە سەرەتای ئەو کاریگەریانەی لەرێگەی پرۆگرامە جوداکانی توندوتیژی و خوێنرێژی لە نێو شاشە گەورەکان دیار دەکەون. ئەم منداڵە کەهەست بە پێشیلکاری و ئازارو ترس دەکات، نایەوێت لەرێگەی تەلەڤیزیۆنەوە ئازار بدرێت و خەڵک رقیان لەیەکتر ببێتەوە. لەکردەوەدا وایە، کاتێک منداڵ سەیری ئەمجۆرە پرۆگرامانە دەکات روبەروی ترس و نیگەرانی و دڵەراوکێیەکی ترسناک دەبێتەوەو ترسی هەیە خەڵکی لەهەموو شوێنێک ئازاری بدەن و هەست ناکات خەڵک دەگەڵ یەکتر باش و رێکن.

بەپێی سەرچاوەکانی رۆژنامەی یوئێس ئەی تودەی لەساڵی ١٩٩٣دا ئاماژەی کردووە کە ٩کەس لە تێکڕای ١٠ کەسی بەتەمەن کاتێک دەبینین لە فیلمە خوێناوییەکاندا مەترسی زۆر دەبێت،کەناڵە دەگۆڕن. بەمە دەردەکوێت کە رێژەی ترس و ئازارەکانی فیلمەکانی توندو تیژی بەجۆرێکە مرۆڤی گەورەش تاسەر توانای سەیرکردنیانی نییە.

بۆئەوەی وریای منداڵەکان بین و کەشێکی گونجاو لەروی پەروەردەییەوە بۆ منداڵان پێکبهێنین، پێویستە خێزان ئامادە بێت بە هاوکاری منداڵەکان. لەرێگەی ئاسانکاری و تێگەیاندن.. لەرێگەی پەیداکردنی زانیاری دروست و گونجاو دەربارەی پرۆگرامی

خوێناوی. هەروەها تێگەیشتنی دایک و باوک زۆر گرینگە، بۆ ئاسانکاری لەپێناو گرتنەبەری ڕێگەی بەسود بۆ دوور گرتنی منداڵەکان لەکاردانەوەی سلبی. بۆیەشە دەکرێت چەند هەنگاوێک لەمبارەوە بنێن.

## ئەو شتانەی باشە بیزانین

- خوێنریژی لە شاشە گەورەکان چییە، ئایا تۆ هیچ کاتێک مرۆڤ یا گیانەوەرت بینیوە کارێکی لەمجۆرە بکات، کە پێی دەگوترێت خوێنرێژی؟. ئەمە چ جۆرە هەستێکت لادروست دەکات؟ ئایا کاتێک خوێنرێژی لە تەلەڤیزیۆن دەبینی هەست بە جیاوازی دەکەیت؟
- ئایا تۆ بڕوا دەکەیت خەڵک حەزی لەسەیرکردنی پرۆگرامی لەمجۆرە بێت لە تەلەڤیزیۆن؟
- ئایا جۆری جیاوازی ئەم پرۆگرامانە هەیە، کامەیان پتر کاریگەری لەسەر تۆ هەیەو کامەیان وات لێدەکەن هەست بەترس بکەیت؟
- کامە جۆری لای تۆ مایەی دروستکردنی خۆشییە؟
- کامە کارەکتەری پرۆگرامەکە کاری توندوتیژی و خوێنرێژی ئەمجام دەدات؟
- دەکرێت جیاوازی نێوان کەسێکی باش و خراپم پێ بلێت؟ ئایا لای تۆ ئاساییە کەسێکی باش ئازاری خەڵکی بدات؟ یاخود پێت راستە کەسێکی باش لە نێو شاشە گەورەکان هێز دژی خەڵکی تر بەکاربهێنێت؟

- بۆچی هەلسوکەوت و خورەوشتی کارەکتەرەکە خوێنرێژانەیە؟ ئایا تۆ بڕوات وایە کێشەکە لەرێگەی خوێنرشتن و بەکارهێنانی توندوتیژی چارەسەر دەکرێت؟ ئایا دەتوانیت پێم بڵێت کێشەکە چییە؟.

- کاتێک تۆ دەبینیت کارەکتەری قارەمان ئازاری خەڵک دەدات و لەهەمان کاتیشدا خەڵک ئازاری ئەو دەدەن، تۆ هەست بەچی دەکەیت؟ بیر لە چ بەسەرهاتێک دەکەیتەوە لەکاتی وەهادا؟ ئایا تۆ هیچ روداوی وەهات بەسەر هاتووە؟

- ئایا کاریگەری ئەمجۆرە بەرنامە چییە، کە تۆ تێیدا ئازارو خوێن رشتن دەبینی.. ئایا هەست دەکەیت ئەمە بەراستی ئازار دروست دەکات، یاخود نا؟ ئایا ئەمەی لە شاشە دەیبینی راستە یا نا؟ تۆ هەست بەچی دەکەیت ئەگەر روداوی وەات بەسەرهات؟

- کاتێک تۆ هەمان پرۆگرام بێ بەکارهێنانی توندتیژی دەبینیت، ئایا هەست بە جیاوازی دەکەیت؟

- ئایا کاتێک سەیری ئەمجۆرە بەرنامانە دەکەیت هەست بە چ دەکەیت، خۆشی، یا ترس؟ بۆچی؟

لەرێگەی دوان و گفتوگۆ لەنیوان خێزان و منداڵ دەتوانرێت رۆشنبیرییەکی سەرەتایی لەبارەی ئەمجۆرە پرۆگرامانە دروست بکرێت، تاکو لەلایەک لە نێوەرۆک و گرینگی و ترسەکان بگەین و لەئالەکی دنیشدا ئەو رێگا چارانە بدۆزینەوە کە ئارامی و ئاسایش بۆ سەیرکردنی تەلەڤیزیۆن دروست دەکەن.

ئێمە خودانی بەرنامەو پرۆگرامی خۆمالی کوردی نین لەبارەی پرۆگرامی خوێناوی تەنیا پرۆگرامەکانی هەوال و ئەو بەرنامە بیانیانە نەبن، کە هەندێک تەلەڤیزیۆن پەخشی دەکەنەوە، یا ڤیدیۆ کە خەڵک بی سانسۆرو دوور لە چاودێری بەکاریان دەهێنن و فیلمی کارتۆنەکانی منداڵان کە هەموومان راستەوخۆ سەیریان دەکەین و زۆربەیان بە زمانی ئینگلیزین.

لەگەڵ ئەوەشدا راگەیاندنی کوردی دوور نییە لە بلاوکردنەوەی ئەمجۆرە بەرنامە هاوردانەی لیواولیوی توندوتیژین، یا هەواڵ و روداوە خوێناویانەی رۆژانە دەربارەی روداوە جیاکان بڵاویان دەکەنەوە. منداڵانی کوردستان خێزانەکان بێ هوشیاری و رۆشنبیری پێویست ولێکدانەوەو دەزگاکانیش بێ سەرپەرشت و راوێژکار بۆ هەموو ئەو روداوانەی پەخشیان دەکەن، شتەکان بۆ خەڵکی دەگوازنەوە.

لەکوردستاندا پێوسیتمان بە چەند هەنگاوێک دەبێت بۆ پێکهێنانی کەشێکی دوور لە ترس و نیگەرانی لەهەمبەر ئەو پرۆگرامانەی توندوتیژی و خوێنیان تێدایە

- کار بکرێت بەرهەمی خۆمالی بۆ پێگەیاندن وپەروەردەی منداڵان دروست بکرێت. تاکو لە بنەما گشتیەکانی توندوتیژی و خوێن ریژی دوور بن.
- رۆشنبیری وهوشیاری راگەیاندن لەرێگەی وۆرک شۆپ و خولی تایبەتی بۆ خێزان و دەزگاکانی راگەیاندن پێکبهێنریت.
- لەکاتی سەیرکردنی ئەمجۆرە پرۆگرامانە پرسیار لە بینەران

بکرێت، بەتایبەتیش منداڵان

١- کامە پاڵەوانی لا چاک و خێرگوزارە، کامەشی لا خراپ و شەڕانگێزە؟

٢- چ روداوێک بۆتە هۆکاری ئەمجۆرە پرۆگرامانە؟

٣- ئایا لەکاتی سەیرکردنی کارتۆندا چۆن روداو هەلسوکەوتی خوێناوی و توندوتیژی هەست پێدەکات؟ ئەم توند تیژیە چی دەگەیەنێت؟

٤- ئایا لەکاتی سەیر کردنی پرۆگرامەکان هەست بەچی دەکات؟ ترس، نیگەرانی، رق لێبوونەوە، خۆشەوسیتی، ئاشتی، شەڕ؟

٥- ئایا قارەمانی سەرۆکی روداوەکان بەراست دەزانێت کاتێک توندوتیژی دژی خەڵکی بەکاردەهێنێت، یاخود نا؟ بۆچی؟

٦- ئایا کاتێک توند تیژی و روداوەکانی خوێنرێژی لەنێو پرۆگرامەکان دەربهێنی، پرۆگرامەکە چی دەگەیەنێت؟

٧- ئایا بۆچی حەز لە پرۆگرامی توندوتیژی دەکات، یاخود پێچەوانە بۆ لەگەڵی ناگونجێت؟

٨- ئەگەر خۆی یەکێک بێت لە پاڵەوانی پرۆگرامەکە چۆن هەلسوکەوت دەکات؟ پەنا بۆ توندوتیژی دەبات یاخود نا و بۆچی؟

٩- ئایا ئەم روداونەی نێو کارتۆنەکان بەراست دەزانی یان نا؟ ئەو هەست بەچی دەکات کاتێک ئەم هەموو روداوانە دەبینێت؟

(١٠)

## منداڵی جودا، پرۆگرامی جودا

به سروشت منداڵ لێکجودان، هەتا دوو جمکیش ئاساییە لیکجودابن. بۆیە کاتێک باس لە پرۆگرامت تەلەڤیزیۆن و میدیا بەگشتی دەکرێت، رەچاوکردنی جیاوازی ئەم پێکهاتنە سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژیەی هەیەتی. یانژی لەروی تەمەن و فسیۆلۆژی و ئەو شوێنەی تێیدا دەژیت. چونکە ئەمانە هەموو پێکڕا کاریگەری لەسەر رۆشنبیری و پەروەردەی منداڵان دەکات.

خێزان دەربارەی جیاوازییەکانی پێکهاتەی منداڵ دەزانن و ئاگاشیان لە جیاوازی گەشەسەندنی منداڵ لەبوارە جیاکان هەیەو دەزانن چۆن لەروی خورەوشت و توناولێهاتوویی و پیکهێنانی ئارەزووەکانی منداڵ بەجیاوازی گەشە دەکات. کاتێک باری تەندروستی منداڵ دەگۆرێت، باری رۆشنبیریشی گۆڕانی بەسەردا دێت. بۆیە کاتێک دەتەوێت بەرنامەی پەروەردەیی منداڵان دروست بکەین، پێویستیمان بە بە لێکدانەوەی پاشخان و چۆنیەتی گەشەکردنی منداڵ بکەین.

## تەلەڤیزیۆن

جودایی
منداڵ

باری سۆسیۆلۆژی        باری سایکۆلۆژی    باری فسیۆلۆژی

شوێنی ژیان          کەلچەر

## خێزان

باری ئابوری        باری کۆمەلایەتی        رۆشنبیری

## گەشەكردن

قوتابخانە

فێربوون نواندن رۆشنبیری چالاكی

پەروەردەی جودا
گەشەكردنی جودا
پێگەیشتنی جودا

## ئەنجام

هاوبەشی و یەكسانی و بەختەوەری

بەپێی ئەم هێلکارییەی سەرەوە پەیوەندی نێوان جودایی و سەرەتای کارکردنمان دەگەڵ منداڵ بۆ پێگەیاندنی کەلچەرێکی جوداو میتۆدی جودا بۆ پێگەیاندنی منداڵان تێدەگەین. چونکە ناکرێت منداڵیکی کەم ئەندام وەکو منداڵیکی تەندروست چاک بیربکاتەوەو هەلسوکەوتی هەمان شت بێت، کەوایە کاتێک دەمانەوێت پرۆگرامێکی سادە بۆ منداڵان لەتەمەنی ٣-٦ ساڵی دروست دەکەین. ئەم منداڵانە پێکهاتەی جودای (کۆمەڵایەتی و ئابوری و دەروونی وژینگەو تەندروستیان) هەیە، چۆن دەتوانرێت پرۆگرامێکی گونجاو و واقیعی بۆ ئەم منداڵانە پێکبهێنرێت کە جودان و جیاوازیان لەهەموو شتێک هەیە. واتە چۆن هاوسەنگی پەروەردەیی و دەروونی لەنێوان منداڵێکی ساخ و یەکێکی تووش بووی نەخۆشی، کەسێکی هەژارو دەولەمەند، کەسێکی شاری و گوندی، کەسێک لە نێو تەکنەلۆژیاودەژیت ویەکێکیش لەنێو سروشت دەژیت و ئاگای لە کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت نییە.

چۆن بتوانین لەرێگەی جودایی هاوبەشی و هاویەکی و یەکسانی دروست دەکرێت، کە لێرەدا زۆر گرینگە بایەخ بە بنەماکانی مافی مرۆڤ و مافە کۆمەلایەتی و رۆشنبیرییەکانی منداڵان بدەین کەلەنێو کۆمەلگای نێودەولەتی رێزی لێدەگیرێت و کاری پێدەکرێت. زۆر گرینگە لەروی رۆشنبیرییەوە منداڵ لە جیاوازی (دین و سێکس و خورەوشت و باری کۆمەڵایەتی) بگات.

تەمەنی جودا پێویستی بەرنامەی جودا دەبێت، چونکە کارێکی نەگونجاو دەکرێت کاتێک بێ بایەخ دان بە جودایی لەتەمەن ناتوانرێت پرۆگرامی سەرکەوتوو بەرهەمبهێنرێت، چونکە دەزانرێت توانای منداڵێکی ٣ ساڵی جودایە لەیەکێکی ٦ ساڵی وهەروەها توانای

سەیرکردن و زەوق وەرگرتنی منداڵێکی ٢ساڵی جیایە لە منداڵیکی ٤ ساڵە، هەروەسا وێنەو زمان و بەسەرهاتەکان و کارەکتەرەکانیش لێکجودان. بەهەمان شێوە ئەم جیاوازییە لەسەرجەم تەمەنی منداڵ دەردەکەوێت و توانای منداالێکی راکردنی کوڕێکی تەمەن ٨ ساڵە جیاوازە لە هی کچێکی هەمان تەمەن.

مەبەستمان لە ئاماژە پێکردنی ئەم سەرەتایانە لەجیاوازیەکان، چۆنیەتی بەرهەمهێنانی پرۆگرامی جودای منداڵانە لە نێو بوارەکانی میدیا، چونکە ئێمە لەرێگەی تێگەیشتن و دیاریکردنی جوداییەکان و کارکردن بۆ رێزگرتنی کەلچەری جوداو پێکهاتە تەندروستی و تەمەن وسایکۆلۆژیای جودا، دەتوانین هاوبەشی و یەکسانی لەرێگەی ئەم کارانە دروست بکرێت.

ئامانجی هەرە سەرەکی ئەوەیە لەرێگەی رێزگرتنی جودایی لە پرۆگرامەکانی منداڵان، منداڵ لەسەر تواناو لیهاتوویان بەپێی جودایان رابهێنرێن، هەروەها کۆمەلگای جوداش لەگەڵ ئەم کۆمەلگا ساواو سەرەتاییەی منداڵان رابهێنرێت کە پێویستیان بە زانیاری و تێگەیشتن هەیە. سەرباری ئەوەی دەکرێت منداڵ بۆ ئەو کەشە جودایە ئامادە بکرێت و ئاشنا بکرێت کە هیچی نابێتە مایەی کەموکوڕی وشەرمەزاری بۆ ئەوان، بەلکە ئەم جیاوازییەی هەیە کارێکی سروشتییەو پێویستی بە روبەروبوونەوەو کاری سروشتی و ئاسایی هەیە، بە بەرزبوونەوەی ئاستی رۆشنبیری و میتۆدی پەروەردەیی چاکتر دەتوانین ئەم پرۆگرامانە دروست بکەینە، کەبەرەو لیهاتوویی و توانای پەروەردەیی و گەشەکردنی جودامان دەبات، کەلەئەنجامدا کۆمەلگایەی ئاسودەی منداڵان و بەختەوەرو یەکسان بێتە دی.

(١١)

## راستی و گەڕان بەدوای وێنەی کێشراو

ئێمە دەزانین کاتێک مرۆڤ لەبەردەم شاشەی تەلەڤیزیۆن دادەنیشێت هەست دەکات روداوی راستەقینەو وێنەی راستەقینە دەبینێت، خۆی لەراستیدا پرۆگرامەکان راستن، بەلام ئەمانە هەمووی وێنەی دەستکردو چیرۆکی دروستکراوی خەیاڵین و دەیانەوێت بای روداوە راستەقینەکان بکەن. زۆر قورسە منداڵ لەنێوان راستی و خەیاڵدا کێشە ئالۆزو روداوە رستەقینەکان لێکهەڵاوێرێت.

لێرەدا مەترسی ئەوە هەیە، کەپشت بەوە ببەسترێت کە وێنە گوزارشت لە هەقیقەت دەکات، تەنیا ئەوە نەبێت کە لێرەدا ترسێک هەیە بۆ سەیرکردنی هەقیقەت، کەرەنگ لە وێنە دەداتەوە. هەمیشە تەلەڤیزیۆن بەوە تاوانبار دەکرێت کە وا لەخەڵکی دەکات بەشێوەیەکی خەیاڵی لە واقیعدا بژین.

بەپێی بۆچوونە دیارەکانی لێکۆلینەوە لەمبارەیەوە تەلەڤیزیۆن بەرپرسیەکی گەورەی، لەبەشداریکردنی منداڵان لەژیانی حەقیقی هەیە. بەڵام ئەمە بەرپرسیەتییە لەئەهنجامی تێکەڵکردنی واقیع و وێنە نەهاتووە، بەلکو خەلکێکی کەمتر کاریگەر دەبن بە درامای تەلەڤیزیۆنی بەبەراورد بە درامای واقیعی.(٤٠)

بۆیە کاتێک دەمانەوێت باسی کاریگەری تەلەڤیزیۆن لەسەر منداڵ لەرێگەی وێنەو حەقیقەتی روداوە راستەقینەکان دەکەین، ئەم کاریگەریانە لای منداڵ خێراترو فراوانتر دەردەکەوێت. راستە مرۆڤ توانای جولەو بیرکردنەوەی هەمەلایەنەی هەیەو دەتوانێت لەگۆرانکاری وروداوەکاندا توانای جودا پیشان بدات، بەلام ئەمانە مانای ئەوە نییە، دوور لەترسناکی کاریگەرییەکانی تەلەڤیزیۆن نییە.

تەلەڤیزیۆن بینەر دێختە بەردەم ترسناکییەوە، کەمرۆڤ دوجاری کارلێکردن لە حالەتی جودا دەکات.بۆیە کاتێک مرۆڤ رۆژانە فیمی ترسناک و کوشتن و برین و خوێناوی دەبینێت، ترسی لێدەنیشێت لەکاتی بینینی روداوی لەمجۆرە. یاکتێک رۆژانە هەوالی ترسناکی روداوەکانی دزی و کوشتن و روداوەکانی پۆلیس دەبینێت، ترسی ئەوەی لێدەنیشێت دەرگای ماڵەوەی کراوەو ئاسودە بێت. بەمجۆرە ئەم هەموو زانیارییە جودایانە وا لە بینەر دەکەن پتر لە نیگەرانی وگومان بژین و وا دەکات خەڵکی تر پشتگوێ بخەن و خۆیان بەتەنیا بینەری روداوە درامییەکانی خۆیان بن.(٤١)

ئەمجۆرە کاریگەریانە لای منداڵیش دەردەکوێت، بۆیە کاریگەری دەرەکی لای منداڵان لەنیگەرانی و گوێپێنەدان و گۆشەگیری و ترس

دەردەکەوێت. ڕاستە تەلەڤزیۆن کار دەکات وێنەی ڕاستی ڕوداوەکان بگوازێتەوە، بەلام لەبەر ئەوەی دەرهێنەر بۆ ڕاکێشانی سەرنجی بینەرو کۆکردنەوەی پتری بینەر کاردەکات، ئاساییە ئەو وێنانە بگوازێتەوە کە کاریگەریان لەروی سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی خیراترو کاراترە. لەم حالەتەدا واقیع دەگۆڕێت بۆ خەیاڵی پاڵنەرو بینەریش لەنیگەرانی بڕواپێهێنان و متمانە بە ڕوداوەکانی نێو تەلەڤیزیۆن دەژیت.

با بچێنە لایەنێکی تری ئەم وێنە واقیعینانەی منداڵ لەتەلەڤیزیۆن دەیانبینن. وێنەی ژیانی کۆمەلایەتی مرۆڤ و گیانەوەرو کشتوکاڵ و سروشت و ڕوداوە ساکارەکانی دەوروپشتە. لەکردەوەدا ڕوداوە ڕاستەقینەکان منداڵی فێری ڕۆشنبیرییەکی بەرفرە دەکەن، کەزۆرجاران خێزان ومامۆستا تووشی سەرسامی دەکەن، کەچۆن و لەچ سەرچاوەیەکەوە منداڵ ئەم هەموو زانیارییە گرینگانە دەربارەی ژیانی گیانەوەران و گەشەکردنی داروبارو گۆڕانکارییەکانی سروشت فێربوون. لەم بوارە تەلەڤیزیۆن بەکردەوە ڕۆلی پەروەردەیی دەگێرێت و منداڵ و بینەر لە بەسەرهاتە ڕاستەقینەکان نزیک دەخاتەوە.

وێنە لەتەلەڤیزۆندا ڕۆلی سەرەکی لەپێکهێنانی بڕواپێهێنان بە ڕاستی و خەیاڵی پیشاندانی واقیع دەگێڕێت. بۆیە ئاساییە هەمیشە بە گومان و پرسیارەوە سەیری تەلەڤیزیۆن بکەین. بەلام لەبیرمان نەچێت مرۆڤ توانای لێکدانەوەی هەمەجۆری تێدایەو منداڵان هەرچەندە کاریگەری دراماو ردواوە تەلەڤیزیۆنییەکان بەسەرەوە

دەبیت، بەڵام دەزانن جیاوازی لەنێوان راستی دراما و خەیاڵی بوونی روداوەکان بکەن.

لەمبارەوە لێکۆلینەوەکان دەریان خستوە کەمنداڵ لەتەمەنی ئاسایدا توانای خۆپارێزیان لە کاریگەری روداوەکان لەنێوان جیاکردنەوەی راستی و خەیاڵی روداوەکان بکەن. لە لێکۆلینەوەیەکدا دەرکەوتووە کە ٩٢% منداڵەکان دەزانن کە سوپەرمان و باتمان بەراستی نافڕن.هەروەها ٧٥%یشیان دەزانن کەشەرەکانی نێو تەلەڤیزیۆن بەراستی نییە و لەهەمان گاڤیشدا ٧٨%یان پێیان وایە ریکلامەکانی ناو تەلەڤیزیۆن دەربارەی گەمەو شیرنەمەنییەکان وا دەکات هەست بکەن راستییە. بێگومان نیشانیشی دەدات کە تێگەیشتن لە واقیعبوون و دوور کەوتنەوە لە راستی نیشاندانی روداوەکانی بۆ جیاوازی لەتەمەنیش دەگەڕێتەوە.(٤٢)

**تێگەیشتن لەکاریگەریەکانی دونیای واقیعی**

| پۆلی یەکەم | پۆلی دووەم | پۆلی چوارەم و پێنجەم |
|---|---|---|
| ١.١٧٨ | ١.٣٢٠ | ١.٦٢١ |

لەم سەرچاوەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کاریگەرانی لەسەر منداڵانی بجوک پترە لە چۆنیەتی تێگەیشتن و وریایی کەمتر لای ئەو منداڵانەی بەتەمەنترن لەوانی تر. رێژەی لاوازی ولەدەستدانی تێگەیشتن و جیاکردنەوەی وێنەکان لەنێو تەلەڤیزیۆندا دیار دەکەوێت چۆنە. تا گەورەتر بین، ئاستی جیاکردنەوەی دونیای واقیعیمان لە دونیای خەیاڵی لا پتر دەبێت.

هەروەها لەم خشتەی خوارەوەدا کاریگەری جیاوازی کارتکردن و جیاکردنەوەی کاریگەری وێنە لای منداڵان لەتەمەنی خودا دەردەکەوێت

## جیاوازی تەمەنەکان، بۆ شیکردنەوەی گۆڕانی وێنە لەتەلەڤیزیۆندا لەرێگەی پەیوەندی بە شتە جوداکان

| ژمارەی پۆلەکان | پەیوەندی بە کامیرا | پەیوەندی بە ژیانی راستەقینە | شتی تر | نازانم |
|---|---|---|---|---|
| پۆلی یەک و دوو | ٣١% | ٣٨% | ٠% | ٣١% |
| پۆلی سێیەم | ٤٤% | ١٢% | ٢٤% | ٣٢% |
| پۆلی چوارەم و پێنجەم | ٤٢% | ٦% | ١٧% | ٣٥% |

## جیاوازی نێوان کورو کچ، بۆ شیکردنەوەیان دەربارەی چۆنیەتی گۆرانکاری لە وێنەکانی تەلەڤیزیۆندا

| | پەیوەندی بە کامیرا | پەیوەندی بە ژیانی راستەقینە | شتی تر | نازانم |
|---|---|---|---|---|
| کوڕ | ٦٠% | ٨.٥ | ١٩% | ١٢.٥% |
| کچ | ٢٢% | ٢٠% | ١٢% | ٤٦% |

# حەزیان لەتەلەڤیزیۆنە بەپێی رەگەز

| | رقی لێیه | حەزی لێ نییه | گرفت نییه | حەزی لێیه | زۆری حەزی لێیه |
|---|---|---|---|---|---|
| کوڕ | ٠ | ٥.١ | ٠ | ٢٣.١ | ٧١.٨ |
| کچ | ٠ | ٧.٠ | ١١.٦ | ٣٢.٦ | ٤٨.٨ |

حەزیان لە تەلەڤیزۆنە بە پێی رەگەزو تەمەن

| | زۆرنا | | گەلێک زۆر | |
|---|---|---|---|---|
| | کوڕ | کچ | کوڕ | کچ |
| پۆلی یەک | ٠ | ٠ | ٣٠.٧٦ | ١٦.٢٧ |
| پۆلی دوو | ٥.١٢ | ٦.٩٧ | ١٥.٣٨ | ٩.٣٠ |
| پۆلی سێ | ٠ | ٠ | ٢٥.٦٤ | ٢٣.٢٥ |

### سەیری تەلەڤیزیۆن کردن بە دو دڵی و نیگەرانی بەپێی ڕەگەز (%٣٩) کوڕو (%٤٣) کچ

| | هەرگیز | کەمێک | هەندێکات | زۆر | کاتێکی زۆر |
|---|---|---|---|---|---|
| کوڕ | ٠ | ٥.١ | ٢٥.٦ | ٣٠.٨ | ٣٨.٥ |
| کچ | ٠ | ١٤ | ٣٧.٢ | ١٨.٦ | ٣٠.٢ |

## کاریگەری  تەلەڤیزیۆن لای بینەران لەسەر دودڵی و نیگەرانی یاخود پێچەوانە بەپێی رەگەزو تەمەن(٢٧)

| | نیگەران دوو دڵ | | نیگەران و دوو دڵ نین | |
|---|---|---|---|---|
| | کوڕ | کچ | کوڕ | کچ |
| پۆلی یەک | ١٠.٢٥ | ١٣.٩٥ | ٢٨.٢ | ٤.٦٥ |
| پۆلی سێ | ١٠.٢٥ | ٢٠.٩٣ | ١٧.٩٤ | ١١.٦٢ |
| پۆلی پێنج | ١٠.٢٥ | ١٦.٢٧ | ٢٣.٠٧ | ٢٠.٩٣ |

لێرەدا دەکرێت هەندێک لەکاریگەریەکانی تەلەڤیزیۆن و دوارۆژی منداڵان سەرنج لێبدەین. بۆمان دەرەکەوێت رێژەی کارتکردنەکان و شیکردنەوەی خودی منداڵان بەپێی تەمەن و رەگەزی کوڕو کچ دەگۆڕێت. بەلام گرینگ ئەوەیە وێنە لەرێگەی تەلەڤیزۆنەوە کە کاردەکات وێنەیەکی واقیعی نیشانی منداڵان بدات، کارتێکردنێکی راستەوخۆی لەسەر هەلسوکەوت و خورەوشتی منداڵان دروست دەکات. منداليش شیکردنەوەی جودایان بۆ وێنە واقیعی و خەیاڵیەکانی سەر شاشە گەورەکان هەیە. وەکو پێشتریش باسمان کرد، رەنگە بڕوا نەهێنێت کە مرۆڤ دەتوانێت وەکو سوپەرمان و باتمان بفڕێت و بێ دوو دڵی ئەمە بە دەستکردو خەیاڵی دەزانێت،

بەڵام کاتێک دەچێتە بەردەم شاشەی روداوە گەرم وگەورەکان نیگەران و دوو دڵ دەبێت، کەبۆچی وچۆن ئەم سوپەرمانە دەتوانێت ئەم هەموو شتە لەعەقڵ و توانا بەدەرانە بکات و ئەو ناتوانێت. یانژی زۆرجاران رێژەی بڕواکردن بە ریکلام زۆر زۆرە، وپێیان وایە ئەمە راستییە.

(١٢)

# خێزان و قوتابخانەو تەلەڤیزیۆن

لامان رونه لەسەردە می ئێستادا خێزان و قوتابخانه هاوکاری یەکتر دەکەن بۆ چاکتر بەرێوە چوونی پرۆگرامەکانی خویندن و فێرکردن، چونکه مندالّ هاوبەشیەکی زۆری دوای چوونه قوتابخانه لەنێوان هەردوو لا دروست دەکات. ئەو شتانەی لەرێگەی پەروەردەوە فێری دەبێت، لەماڵەوەش لەرێگەی خێزانەوە بەشێوەیەکی فراونترو هەمەرەنگتر شتەکان دەبینێت و کاریان دەگەڵ دەکات. کاتێک لە نێو پۆلدا باسی باران و هەورو بەفرو سەرماو گەرمای بۆ دەکرێت، لەدەرەوە لەگەڵ خێزان بە کردەوەو راستی هەستیان پێدەکات و بەهۆی بارینی باران تەڕ دەبێت و هەورو دەبینێت و یاری بەبەفر دەکات و دەستەکانی لەسەرما دەتەزێت و تد. واته رۆلی هاوبەشی پەروەردەیی لەنێوان خێزان و قوتابخانه لە گەشەکردنی زۆردایە. تەنیا لە قوتابخانە پێشکەوتووەکاندا رێگە بە

دایک و باوک دەدرێت لە پۆلدا هاوکاری مامۆستا بکەن.

لایەنی سێیەم کە باسی دەکەین تەلەڤیزیۆنە، زۆر لەقوتابخانەکان تەلەڤیزیۆن لەکاتی دەرس وتنەوە بۆ هاوکاری کردنی تێگەیاندنی قوتابی بەکاردەهێنن، بەڵام لەرێگەی بەکارهێنانی ڤیدیۆو کاسێتی تۆمارکراوی تایبەت بە فێرکردن کەلەلایەن دامودەزگاکانی تۆمارکردن وئەرشیفەوە ئامادەکراون بۆ دەولەمەندکردنی باری رۆشنبیری منداڵان. سەرباری بەکارهێنانی ئامێری دەنگ و رەنگ و وێنەگرتن .

زۆرجاران لە چوارچێوەی پرۆگرامی رۆژانەی فێرکردن، پەنا بۆ بەکارهێنانی نیشاندانی فیلمی دۆکۆمێنت و تایبەت بە پەروەردەکردنی منداڵان پێشکەش دەکرێت، واتە بەکارهێنانی شاشە وەکو هۆکارێکی تر پەروەردەکردن لە نێو پرۆگرامی فێرکردن بەکاردێت، بەواتای ئەوەی دەکرێت تەلەڤیزیۆن وەکو هۆکارێکی ئەری بەکاربهێرێت، بۆ گەشەپێکردنی توانا‌و لێهاتوویی منداڵان و فراوانکردنی زانیاریان دەربارەی رۆشنبیری گشتی.

لەم روانگەیەوە دەرکەتووە کە سەرچاوەکانی تەکنەلۆژیا دەتوانن هاوکاری منداڵ لە بواری فێربوون بکەن، بۆیە دەکرێت بڵێین کە دەکرێت هەموو سەرچاوەکانی راگەیاندن بە منداڵ ئاشنا بکرێت، چونکە ئەمانە سەرچاوەی زانیاری گشتین، لە لێکۆلینەوەکانیشدا دەرکەوتووە تەلەڤیزیۆن بەئاسانی شوێنی گرینگی خۆی دەگرێت(٤٣).

بۆیە ئاماژە بەم بوارە دەکەین تا دەربکەوێت کە ناکرێت شاشە بەهەموو شێوەکانیەوە بە ترس و نیگەرانییەوە سەیر بکرێت، بەپێچەوانە ئەم پرۆگرامانەی لەبواری پەروەردەو فێرکردن بەکاردەهێنرێن گرینگی تەلەڤیزیۆن دەردەخەن. چونکە نەک هەر تەنیا

منداڵ بەلکە گەورەکانیش دەتوانن بۆ دەولەمەندکردنی زانیاری گشتیان دەربارەی بابەتی هەمەجۆری وەکو (ژیانی نێو دەریا، گیانەوەران، روداوە مێژوویەکان، کارەساتە سروشتیەکان، کەشو هەوا، دۆکۆمێنتەکان.. تد ) بەکاربهێنن. بۆیە ئاساییە بڵێین تەلەڤیزیۆن لەگەڵ ئەوەی دوای زالبوونی باری بازرگانی و پیشەسازی تێیدا، پەرەی بە ترس ونیگەرانی داوە، بەڵام دەکرێت ئەم ئامێرە گرینگە لەبوارەکانی پەروەردە بۆ هاوکاری کردنی پرۆگرامەکانی فێرکردن بەکاربهێنرێت.

بەڵام چۆن دەتوانین ئەم ئامێرە بەکاربهێنن، لەکاتێدا رەخنەی زۆر لە چۆنیەتی بەکارهێنان و سەیرکردنی پرۆگرامە جوداکان لەئارادایە، وەکو لێکۆلەرەوەکان دەڵێن دەکرێت منداڵ و گەورەکان بە بەکارهێنەری چالاک ورەخنەگر بن لەهەمان کاتدا، دەکرێت لەکاتی پشوو بێت کە بۆ مەبەستی پەروەردەو پەرەپێدانی رۆشنبیری بەکار بێت و قوتابخانەش ئەم بوارە بۆ پەرەپێدانی رۆلی کۆمەلایەتی منداڵ بەکاربهێنێت(٤٤).

کاتێک تەلەڤیزۆن بەکاردەهێنرێت تەنیا بۆ کات کوشتن بەکار نەیێت، بەلکە منداڵ هانبدرێت بە شێوەیەکی رەخنەگرانە سەیری پرۆگرامە پەروەردەییەکان بکات، تاکو بزانێت چی سەیرکردووەو چی لەم پرۆگرامانە فێر بووە. لایەنی تر گەشە پێدانی باری رۆشنبیری و زانیارییە گشتییەکان دەربارەی ئەو شتانەی کە پێویستیەتی زانیاریان دەربارەی بزانێت.

لەهەموو شی گرینگتر قوتابخانە دەتوانێت هاوکاری خێزان بکات کە چۆن هاوکاری منداڵەکانیان دەکەن تەلەڤیزیۆن بەکاربهێنن و ئەو

بەرنامەو فیلمانەی گونجاون بۆ تەمەنە جوداکان پیشانیان بدرێت.

پێکهاتەی کۆمەلایەتی منداڵ لەرێگەی فێربوونی ئەو بۆچوون و حالەتە کۆمەلایەتیانەی لایەنی پەروەردەیی نیشان دەدەن وەکو (بڕوا بوون بەخۆ، راستگۆیی، هاوکاری، پێکهاتەی خێزان، هاوبەشی و هاوکاریکردنی برادەرەکانی، رێزگرتنی خەڵکی، بەکارهێنانی وشەی گونجاو بەریز،پشت بەخۆبەستن لە راپەراندنی کارەکان، پاکو خاوێنی ...تد). واتە دەکرێت تەلەڤیزیۆن و بوارەکانی تری راگەیاندن وەکو ئامێرێکی پەروەردەیی – سۆسیۆلۆژی گرینگ بەکاربهێنرێن، بە مەرجێک دوور بێت لە بەکارهێنانی تاکەکەسی و دوور لە چاوەدێری، هەروەها سەیرکەران بە دیدی رەخنەگرانە لە روداوو چیرۆک و بەسەرهاتەکان بنۆڕن.

لە ساڵی ١٩٩٠دا بۆ ئارامکردنی منداڵ و کەمکردنەوەی ترس لەو بەرهەمانەی بۆ مندالان بەرهەم دێت کۆنگریسی ئەمەریکی رێگەی بە پرۆگرامی نواندنی منداڵان لەتەلەڤیزیۆن دا. بەمەش کەنالی پی بی سی کە بەرنامەی تایبەتی منداڵانی هەیەو هەروەها دیزنی کە پرۆگرام و فیلمی منداڵان بەرهەم دێنێت کاری زۆریان لەمبارەوە پێشکەش کرد. تەنیا بەرنامەی (Barney and friends) لەکەنالی پی بی سی کرد کە هەموو لایەک دڵنەواییان لا دروست بێت و بڵێن باشە . ئەو کەنالەو هەندێک لە پرۆژە بازرگانییەکانی تری وەکو نیک و دیزنی کار دەکەن لەرێگەی بەرهەمەکانیان شتی تایبەت پێشکەشی خێزان بکەن. هەروەها هەندێک لەکەنالەکان بە کەنالی خێزان ناودەبرێن، لایەنی پەروەدەیی و رۆشنبیریان بەسەردا زالەو لەکاتی ئەمجۆرە پرۆگرامانە ریکلام بڵاوناکەوە، هەروەها (دۆرا) یەکێکە لەو

پرۆگرامانەی کە منداڵ بەتین و تاوی زۆرەوە سەیری دەکەن و تەنیا لە نێو بازارەکانیشدا بە دەیان شتی منداڵانە دەدۆزیتەوە کە وێنەی دۆرای پێوە لکێندراوە، تا سەرنجی منداڵانی پێ رابکێشرێت. هەروەها بەرنامەکانی (دۆراو Doraدراگن تێلDragon tales و لەنێوان شێرەکاندا Between the Lions وبلوس کلوس Blue's Clues) ئەمانە چەند پرۆگرامێکی منداڵان کە هاوکاری سەرجەم منداڵان دەکەن لە روی سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی و پەروەردەییەوە گەشە بکەن، ناوەخنیان پێشکەش کردنی زانیارییە بەشێوەیەکی سادەو خۆشی بەخش بە منداڵان. بۆیە سەیرکردنی ئەمجۆرە پرۆگرامانە بە کارێکی مەترسیدار بۆ سەر خورەوشت و هەلسوکەوتی منداڵان دانانرێن. بەلکە بەسەرچاوەی زانیاری و رۆشنبیری دادەنرێن.

ئێمە لامان رونە کە گەمەی ڤیدیۆو پلەی ستەیشن و ئەوانی تر کاریگەری سلبیان لەسەر گەشە کردنی مێشک و باری سایکۆلۆژی منداڵان هەیهە، بەلام بە پێی دوا زانیارییەکانی ئێستا دەرکەوتووە کەهەندێکجۆرە گەمەی سەر شاشە وەکو Video games WII soprt , Dance dance revolution هەندێک لایەنی ئەرێی لەسەر پیکهێنانی کەسێتی منداڵان هەیەونەک هەر ئەمەش ئەم گەمەیە کە بریتییە لە دوو بەش یەکەمیان شاشەیەو منداڵ سەیری دەکات و دووەمیش گلۆپ و شووێنی خولاندنی پێیە، بەپێی ئەو گلپپانەی دەگەڵ دەنگ و سۆزی مۆسیقا پێدەبن. واتە لەیەک کاتدا منداڵ شاشە سەیردەکات و پێیەکانی ولەشی بە شێوەیەکی خێرایی لەسەر شێوەی سەماکردن دەگەڵ دەنگ و گلۆپەکان دەجولێنێتەوە.کەلە لێکۆلینەوەیەکی زانکۆی نێبراسکا لەئەمەریکا دەرکەوتووە یاری ویی و سەما هاوسەنگی

لەنێوان دڵ و ئۆکسجین دروست دەکات. هەردوو لێکۆلینەوەی زانکۆی نییراسکاو کۆلیژی ئەمەریکا بۆ وەرزشی تەندروستی دەریان خستوە ئەمجۆرە گەمەیەی ڤیدیۆ کاریگەری ئەرێیان هەیە، بۆیە کار گەیشتە ئەوەی ویلایەتی ویست ڤەرجینیا بەکارهێنانی گەمەی ڤیدیۆی (سەما سەما) بێختە نێو پرۆگرامەکانی خوێندنی قوتابخانەکانی لەساڵی خوێندنی ٢٠٠٨ -٢٠٠٩دا. (٤٥)

واتە دەکرێت خێزان وقوتابخانەو تەلەڤیزیۆن و راگەیاندن بەگشتی رۆلی هاوکاری بۆ پەروەردەکردنی منداڵان بگێڕن، بۆیە زۆر گرینگە لە قوتابخانەکاندا بایەخ بە بەکارهێنانی تەلەڤیزیۆن و بەکارهێنانی ئامێری ڤیدیۆ بدرێت، وەکو سەرچاوەیەکی فێرکردنی منداڵان ودەولەمەند کردنی بواری رۆشنبیریان.

(١٣)

# تەلەڤیزیۆن خواردنی زبلخانەیە

کاتێک بمانەوێت باسی دوارۆژی منداڵان لەکەشێکی ئارام و سەرکەتوو، بژین پێویستە رایان بهێنین چۆن ئەم ئامێرە خۆش و لەهەمان کاتیشدا ترسناکە بەکاردەهێنین. پێش ئەوەش پێویستە دایک و باوک پێش زارۆک و بچوکەکان رابهێنرێن چۆن و کەی و بەچ جۆرێک کار بۆ دارشتنی پرۆگرامی سەرکەوتوو دەکەن.

زۆر ئاساییە دڵمان خۆش بێت منداڵەکان بە کتوپڕی فێری کارپێکردنی تەلەڤیزیۆن و ڤیدیۆو سی دی و کۆمپیۆتەرو ئەنتەرنێت دەبن، لەوەش خێراتر هۆگری سەیرکردنی درێژو کاتی نەبراوە دەبن، لەهەمان کاڤیشدا رادێن بێ دەنگ و کپ و دابڕاو لە دونیا لەبەردەم شاشە خەو بیان باتەوەو ئێمەی گەورەش خەریکی کاری خۆیان بن. بێ ئەوەی بیر لەوە بکرێتەوە منداڵ لەسەیرکردنی زۆری شاشە سەرخۆش و گێژو دابڕاو لە دونیا دەبێت.

ئێمە نامانەوێت منداڵ لەسەر چوونە کتێبخانەو خوێندنەوەی کتێب رابهێنین، چونکە لەلایەک کتێبخانەی ک

وردی بایەخ بە مندالان نادات و خێزانیش لەروی رۆشنبیرییەوە نەگەیشتونەتە ئاستی پێویست بۆ گرینگی دان بەلایەنی رۆشنبیری لەنێو میدیادا. راستە ئەم باسە رەنگە هەندێک زوو بێت، بەڵام لەبیرمان نەچێت مندالآن ئێستا لە ئاستێکی بەرزو فراوان سەرچاوەکانی راگەیاندن بەکاردەهێنن. زۆربەی ماڵەکانی کوردستان سەتەلایتی بێ کۆنترۆلیان لەماڵ هەیە، تەلەڤیزیۆن و ڤیدیۆ لەزۆربەی ماڵەکاندا بەکاردێت، بەڵام مەرج نییە بەرنامەکان تایبەت بن بە مندالآن، چونکە گەورەکان بڕیار دەدەن و سەیرکردنی تەلەڤیزیۆنیش کارێکی نیمچە زۆرەملێ دەبێت بۆ بچوک و منداڵەکان.

کاتێک من دەمەوێت بڵێم تەلەڤیزیۆن وەکو خواردنی زبلخانەی لێهاتووە، مەبەستم ئەوەیە کە تەلەڤیزیۆنە جیهانییەکان و وڵاتە ئازادەکان لەرێگەی تەلەڤیزیۆنە رۆژانە سەدان روداوی ترسناک و قسەی بڤەو ناشیرن و کاری توندوتیژی و خوێناوی پەخش دەکەن و لە شاشەی سەرچاوەکانی تری میدیاوە، منداڵ رۆژانە بەدەیان کاری نادروست و ترسناکی روبەرو دەکرێتەوە.. راستە ناکرێت هەموو پرۆگرامەکان بە (خواردنی زبلخانە) بچوێنن، بەڵام بەگشتی پرۆگرامەکان رۆلێکی خراپ لەسەر باری سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی مندالآن دروست دەکەن. لێرەدا نامەوێت بەراوردی نێوان میدیای کوردسان و وڵاتیکی وەکو ئەمەریکا بکەم، تەنیا ئەوە نەبێت کە هێشتا ئێمە پێویستمان بە کۆنترۆلێکی نەرم و دوور لەئازار دەبێت، تا کو لایەنی پەروەردەیی و تێکدەری کۆمەلایەتی لێکجیا بکەینەوە، یانژی ئامادەییەکی پێشوەختانەی رەخنەگرانە لای بینەر (منداڵ – خیزان – قوتابخانە) دروست

کرابێت، تا بتوانن لێکجوداییەکی پێویست لەهەمبەر شتە ئاسایی و روداوە ترسناک و نەرێیەکان دروست بکرێت.

رەنگە تۆ بڵێت ئێمە ئەسپمان نەکڕیوە، ئاخوڕی بۆ دروست دەکەین، رێک وایە ئێمە هێشتا تەلەڤیزیۆن و پرۆگرامی پرۆفەشنالی منداڵانمان لە کوردستاندا دروست نەکردووە، بەڵام تەلەڤیزیۆنی جیاو پرۆگرامی ئایدیۆلۆژی هەمەجۆرو هەمە ئاستمان زۆرن، کە هەر حیزب وگروپێک ژمارەیەک سەرچاوەی میدیا (بینین و بیستن و خوێندن)یان هەیە، سەرباری پرۆگرامە گشتییەکانیان، هەرهەمووشیان کار دەکەن سەرچاوەی راگەیاندنی تایبەت بە حیزب ورێکخراوەکنیشیان بۆ منداڵ و هەرزەکاران هەبێت. هەریەکەشیان بە شێوازی خۆی وتاکە لایەنی و لەروانگەو لێهاتوویی کەسێتی نەک بەرنامە بۆ رێژکراوی ئەکادیمی کارەکانیان بەرێوە دەبەن. واتە بە ئاسانی لە جیاتی پەروەردەکردنی منداڵ لەسەربنەماکانی (مرۆڤایەتی و رێزگرتن و مافەکانی مرۆڤ)، بۆچوونی ئایدیۆلۆژی جودای (نەتەوەیی، ئیسلامی، کۆمۆنیستی، لیبرال) هەست پێبکەین. کەلەراستیدا منداڵ لەجیاتی لایەنی دووەم پێویستی بە فێربوونی ئەو یاری وزمان و گەمەو ئەلف و بێ و ژماردن و چیرۆکانەیە کەلەگەڵ تەمەنی دەگونجێت، بۆیە لەم روانگەیەوە، جۆرێک لە گوفەک و زبلدانمان لا دروست دەبێت، کە منداڵ لەکاتی کۆکردنەوەی خۆراک تێیاندا دوچاری نەخۆشی و لەدەستدانی باری تەندروستی دێن. تەلەڤیزیۆنیش وایە، لەرێگەی بەرنامە رزیو و سیاسی وئایدۆلۆژی وبازرگانییەکان دوچاری لەدەست دانی هاوسەنگی دەروونی دێت، کەئەمەش بەرەو ترس و نیگەرانی و دڵەراوکێ و بڕوانەبوون بەخۆو توندرەویی و پەنا بردنەر توندوتیژی پاڵی دەدات.

# سەرچاوەکان

1. Michael J. O’neill, the roar of the crowd how TV and people power are changing the world.

2. www.tvhistory

.٣USA TODAY WEnsday July, 23 , 2008

4. Fred Rogers, the mister Rogers parenting book. Helping understand your young child.

٥. هەمان سەرچاوە.

6. Jamuna Carroll, Television

٧. گۆڤاری

Time June 23,2008 Special Health issue Our super sized kids,

٨. ڕۆژنامەی

The new yorkTimes, wensday. Ujly 30.2008  Tug of war in food Marketing to children  .

٩- ميريه سالفون، ببير كورسيه، ميشيل سوشن، الطفل االتلفيزيون، ترجمه د.على وطفه، د. فاضل حنا. ديمشق ١٩٩٦.

١٠- هەمان سەرچاوە.

١١- هەمان سەرچاوە.

١٢- هەمان سەرچاوە.

13. Glorla DeGaetano & Kathleen Bander, screen smarts afamily Guide to media literacy.

١٤- هەمان سەرچاوە.

١٥- هەمان سەرچاوە.

16. Jamuna Carroll, Television

١٧- هەمان سەرچاوە.

١٨- هەمان سەرچاوە.

١٩- هەمان سەرچاوە.

٢٠- هەمان سەرچاوە.

٢١- ميريه شالفون، بيير كورسيه، ميشيل سوشون،الطفل و التلفزيون، ترجمة د.على وطفه، د. فاضل حنا، سوريا، ١٩٩٦ .

٢٢- هەمان سەرچاوە

23. Lauryn Axelrod, TV- Proof your kids, a parent's guide to safe and healthy viewing.

24. Patrice Thomas, The power of Relaxatio

٢٥. هەمان سەرچاوە.

26 .Laurie Axelord

٢٧ هەمان سەرچاوە.

٢٨- هەمان سەرچاوە.

29. Jamuna Carroll, Television

30. Jamuna Carroll, Television

31. The NewYork times, Monday July 2008.

32. The NewYork Times. Monday , July 2008

33. Connecticut post , Monday, 28, 2008

34. Laurie Axelord

٣٥- هەمان سەرچاوە.

36. JamunaCarroll, television opposing viewpoints.

37. Jamuna Carroll.

38. Laurie Axelord

٣٩- هەمان سەرچاوە.
٤٠- الطفل و التلفيزيون، ميريه سالفون، بيير كورسيه، ميشيل سوشون، ترجمه د. على وطفه، د. فاضل حنا. ديمشق .١٩٩٦
٤١- هەمان سەرچاوە.
42. Fake fact and fantasy children's interpretations of television reality. Maire Messenger Davies.
٤٣- هەمان سەرچاوە. هەموو خشتەكان تايبەتن بەم كتێبە كە نووسەر وەكو لێكدانەوەی زانستی بۆ دەرخستنی بەراوركردنی كاريگەرييەكانی تەلەڤيزيۆن لەسەر منداڵان لەتەمەن و رەگەزی جودا ئەنجامی داون.
٤٤- هەمان سەرچاوە.
45. USA TODAY Thursday july 31,2008